www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي

# بەیان

ژمارە ٦٩ شوبات ١٩٨١



# بەیان

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی یە

سەرنووسەر : اسماعیل رسول احمد
بەڕێوەبەری نووسین: مصلح مصطفی جەلالی

## لەم ژمارەیەدا



ناونیشان : دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی ـ مەیدانی خەلانی ـ بەغدا ـ ت ٨٨٧٥٧٩٥/٥ خەت




# ئێمە بڕیاری مێژوویی خۆماندا
# بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی
# تەواوەمان بەسەر خاک و ئاوماند

سەرۆکی فەرماندە

# دیاری بۆ شەهیدێت ئێرانێ

رێکێش ئامێدی

- تەژبیر ناکەم -

— ١ —

تە ژبیر ناکەم
لاوێ منا تە ژبیر ناکەم
تە خاتر خواست
خاترا درێژ
ئەڤرۆ ژمن خواست
تو چویە ئەوێ رێگا راست
تە خاتر خواست ژئەڤی ژینی
ژهەمی کەسا
ژئەوا دلا
بیت تە هوی کرینە ڤینێ
ئەژی ئێکم ژووا دلدارا .
هەتا دمرم
دێ ئەز ناڤێ تە پەرێسم
شەیدایێ رێکا تەبوم
منێ گۆتی
ئو ئەز دێ بێم هەمی جارا
ناڤێ تەبو
رەنگێ تەبو
یێ کو بێ بێشکەفتی ڤارا
دەنگێ تەبو
یێ دەنگ ڤەدای لە دارو بارا
یێ بویە رێکەکا ب رەونەق
بو هەمی سێ وی و هەژارا .

— ٢ —

دێ بیرامن لتە هێتەڤە
دەمێ چویچك
چول سپێدەهیا
ئاوازێت ئازادیێ دخوینن

دەمێ ئەو تۆلازیت گرتی
ژگرتیخانا تێنە دەرێ
ئو دەیبابێت خو ددبینن
دەیبابێت وا
ژخەریبیادا
ژ ژکەربێت و روژێت نەخۆش
هەر ژدیرڤە ژدلەکێ خەریب
خو دجەگەرا خو دوەرینن

— ٣ —

دێ بیرا من لتە هێتەڤە
دەمێ شڤان
سترانو لاڤژێت خو شێی
دووبارە دکەتو دبێتەڤە
دەمێ بێریك

کەڤنە مەشکا خو دکێتەڤە
دەمێ زارۆکێت مەکوردا
ئالاێ جوان
نوی ئالایێ ئازادیێ

بلند دکەن
دکەنە گازی
دبێژن گەلا
ئاگە هداربن لمزکینیامە :

ئالایێ مە کوردا ئەڤە
دێ بیرا من لتە هێتەڤە
دەمێ جوتیار

پوسیدەدبیت وتنگژیت
ڕادبیتە تالبەی دوژمنا
بدەنگەکێ خوڕت
دکەتە گازی

دوژمنا ئمردێ من بدەڤە
ئو ڕۆناهی دکەتە هموار
یادبێتە شەڤ ڕەشێ ب ڕەڤە
ئو ئازادیا ددبێژیتە زووردارێ

ڕابە بەسە تو مالاخو
ژڤێرە ب بەڤە

— ٤ —

لاوێ منا ناڤێتە گەلەکێ بسەنگبو
جهێ خویێ لدلاکری
وا گۆتنو کریارێت تە
ناڤێ مە یێ لدنێ بری
ئەو ڕێکێت تە بومە دانایێن
بو دوژمنا بونە ستری

سەهاتە بو دوژمنێت مە
هەر گەلەکە
دسەر هندێڕا تویێ مری
یا دیارە وهەمی دزانن

چەند ڕۆژ بهێن ژ دیروکامە
ڕۆژ بو ڕۆژێ
تو پێتر ب ناڤو دەنگ تری

— ٥ —

چاڤێت مللەتی دکورەبون
تو بوی تەلێ ڕۆهن کرین
مللەتێ مە

مللەتێ ژار
چەندبو دخەوەکا کویر دابو
تو بوی کوتە ژخمو ڕاکرین
تە ڤیان نیشا هەمیادا

بو وەلاتێ مەیێ شرین
تە دیار کرو گوتە مە
دڤێتن گولێ ئاڤ بدەت خوین
ئەگەر ئەم خو بەرهەڤ تەکەین

بو ئاستەنگا
سەهەاتە بو دوژمنێت مە
ستریا ژێڕێکا خو ڤەنەدەین
دێ پاتکا خو دەتەمە ژین .

# سەروەت

سەرت ناوە ، بەسنگی تاشێکەوە
هەردوو ئەژنۆت ، توند لەزەوی گیرکردوە
ئەڵێی لەبن ئەو تاشەدا ، لەدایك بووی
نیازت وایە ، دوای مردنیش جێی‌نەهێڵی

★ ★ ★

سەرت ناوە بەسنگی تاشێکەوە
لەسەرلا ، شانت داداوە .. و
چاوی چەپت ، نوقاندووە
پەنجەی باوەڕ ، ئامادەیە و
بەخوێنی تۆڵە ، تینووە
کەوەکانیش ، بەسەر لوتکەی چیاکەوە
سروودی « نابەزین » ئەڵێن
تۆش لەدەنگی « کەو » تێ‌ئەگەی
بۆیە بەدڵ ، سروودەکە ...
لەگەڵیاندا ، ئەڵێیتەوە

★ ★ ★

سەرت ناوە ، بەسنگی تانشێکەوە
هێشتا تەمەنت خونچەبوو
لەهەرەتی جوانیدا بووی
هەر ئەوکاتە ، لەناخەوە حەزت ئەکرد
لەپێستی بێ‌دەنگی خۆتا ، بچیتەدەر
لەگەڵ کاروان ...
بەرەو خەبات ، بەرەو سەنگەر
ڕێگەی ژیان ، بگریتە بەر .
نەشتزانی ..!



# ـايەك

**شیعری : ڕەزا حەمە فەرەج**
**پێشکەشە : بەکوردستانی ئێران**

ڕێگا سەختو بەردەلاَنو سەرەولێژە
ڕێگا دوورە و .. سەفەرەکەت ...
سەفەرێکی ، دوورو درێژە
ئەشتزانی ..!
ئەگەر ئەو ڕێگایە بگریت
جارێکی تر ،
« نە دایکە ڕەشپۆشەکەت ..
دەبینیتەوە ،
نە بەدیداری ، دەزگیرانەکەت ..
شاد ئەبیتەوە »
بەلاَم ڕۆشتیت !!!
چونکە ئەت ووت ..
سەنگەرەکەی باوکم چۆلەو ، جێگای ئەگرم
چونکە ئەت ووت ..
من بەدیلی لەدایك بووم
نامەوێ بەدیلی بمرم

* * *

سەرت ناوە بەسنگی تاشێکەوە
تۆ خاوەنی ، ئەو بیرو بڕوا بەهێزەی
کە ئاواتی ، گوڵی سووری ..
لەناو دڵی ، چەوساوەکانی جیهانا ، چەقاندووە
تۆ قالبوی فەلسەفەیەکی
خوانی ، بەختیاریو ژیانی ،
بۆ مرۆڤە هەژارەکانی سەرزەمین ، ڕاخستوە
لەوەتەی هەیت ،

لە ئاسۆی سوور سەرنج ئەدەیت
سەرەتاکەش !
هەر ، لێرەوە دەست پێ‌ئەکات .

* * *

سەرت ناوە ، بەسنگی تاشێکەوە
کێ نازانی !
تۆ لەگەورە ، گەورە**تری !**
تۆ لەمردن ، بەهێزتری **!**
تەمەنی تۆ ، لەتەمەنی ،
گشت سەدەکان ، درێژترە
سەدە دێتو .. سەدە دەڕواو .. دەبڕێتەوە
تۆ ناوەکەت ، بەخوێنی **خۆت** ، نوسیوە
بۆیە هەمیشە تەمەنت ،
لەگەڵ ڕەوڕەوەی ، مێژودا ئەخولێتەوە .
تۆ نامریت .. !
گەر بش مریت
بەلاشە ئەمریت ، نەك **بەگیان**
گەر بش مریت ..
دوای مردنت ، بۆ هەمیشە دێیتە ژیان
من ئەزانم !!
بەمەرگی تۆ
خەمی میللەتێ ئەڕەوێ
من ئەزانم .. !
لە ئاسۆی گۆڕەکەی تۆوە
خۆری ژیان دەرئەکەوێ .....

# چەند سەرنجێ دەربارەی پەیوەن

سنوری عیراق لەگەڵ ئێراندا زیاترە لە هەزارو سێ‌سەد کیلۆ مەتر ، ئەم سنورەش بەشێکی گرنگی سنوری نیشتمانی عەرەبی رۆژ هەڵاتە ، ئەم سنورە بەرینە وا لە روداوەکان دەکات کە لە هەر بەشێکیا روبدات کار بکاتە سەر بەشەکانی تر ، بە واتایێکی تر سنوری رۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەبی بەشێکی مەوزوعی‌یە لە بەشەکانی واقیعی نەتەوایەتی نیشتمانی عەرەبی ، بۆیە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەمەدا فامێکی تەواوی دەوێ کە بە بەرینی ئەم سنورە بێ کە روداو لە سەری‌و لە دەوریا رودەدات‌و گۆرانکاری تێ دەکەوێ .. ئەرکی بەرگری لە سنوری هەر هەرێمێکی عەرەبی ، ئەرکێکی نەتەوایەتی‌یە نەك هەرێمایەتی ، ئەمەش بەر پەچی ئەوە ناداتەوە کە لە نێواندا کێشەی ناو خۆیی نەبێ ، وەك

کێشەی لەوەرگاو ئاوی هاو بەش ، بەڵام هەر کێشەیەك لەم کێشانە پەرە بسێنێ بکاتە ئاستی ئەوەی لەکە بخاتە سەر سیادەی عەرەبی‌یەوە ئەنجامەکەی ناکەوێتە سەر ئەو بەشەی کە ناکۆکن لەسەری بەڵکو دەکشێتە سەر درێژایی سنورەوە ، ئەمە جگە لەوەی هەر دەستدرێژیێک بەسەر هەر هەرێمێکی عەرەبی کێشەیێک پێک دەهێنێ راستەوخۆ کار دەکاتە سەر هەموو وڵاتانی عەرەب ..

سنوری رۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەبی تەنها یەك کێشە نی‌یە روی تێ کردبێ بەڵکو کۆمەڵێ کێشەیە لە گەوهەردا دورە لەو کێشانە کە وڵاتێکی تر لە سەر سنوریا رودەدات چونکە تایبەتیەتی ـ پاشان رون دەبێتەوە ـ دەلکێتە سەر کێشەکانی سنوری رۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەبی و پێویست دەکات بزانرێ‌و پشت گوێ نەخرێ .

سەرەرای تێکچرژانی ئەو کێشانە لە روی هۆ وروکەش و ئەنجامەوە ، بۆ سوك کردنەوەی کاری پێناسینی هەوڵ ئەدەین لە یەکتریان جیاکەینەوە ، لەو کێشانە ، دەسنیشان کردنی سنوری سیاسی‌یە چ لە زەوی یا روبار یا دەریا بێ



# دی یدکانی عیراقی و ئیرانی

زانراوە کە ناوچەکە روو بە رووی ئەزیەتێکی زۆر هاتووە لە پێناوی دانانی وەسفێکی دیاری‌کراو بۆ ئەو سنورە ، دەستنیشان کردنی سنور بە شێوەیێکی هەمیشەیی کۆتایی بە کێشەی مەڵبەندە یاساییەکانی هەرێمە جۆراو جۆرەکان دەهێنێ ، لە بیریشی نەکەین هەندێ لایەنی ئابوری گرنگ ئاڵاوەتە هەمان کێشەوە ، ئەویش تەنگاو و ئەو زەوی‌یەی دەوری سامانێکی بەترۆلی زوری هەیە ، چ لە ئاستی ئەوەی ئێستا وە بەرهەم دەهێنرێ یا وەکو دەستەگیەکی خەزن‌کراو بێ . بەڵام کێشە سیاسی‌و

کۆمەڵایەتی‌یەکان بە تایبەتی مەسئەلەی سیادە و سروشتی رژێم‌و پەیوەندی‌و تەرکیبی کۆمەڵایەتی ئەو هەرێمانە ، بە ووشەیێکی رونتر ، ئیدعائاتی ئێرانی بۆ هەندێ هەرێمی رۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەبی بە درێژایی سنوری عەرەبی و ئێرانی ، وای لە ئێران کردووە کە شێوەی جۆراو جۆر بۆ ئەم ئیدعائاتانەی بخاتە کار ، لەوانە شێوەکانی راگەیاندن‌و زۆرەملی بەکار هێنان‌و

غەزوی عەسکری‌و ئەوشتانەی کە دەتوانین ناوی غەزوی کۆمەلایەتی لێ‌نین کە لە کۆتاییدا مەبەستی دەست بەسەرا گرتنی راستەوخۆیە بەڵام شێوەی دەبلۆماسی پەنا بردنە بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ کردنەوە لەسەر یەکێ لەو داوایانەی تا هەڵپەیان لە شێوەی رێککەوتنێکا کۆکەنەوە ، ئەگەر رێککەوتنەکە بەدەست نەهێنن ئەوا پەنا دەبەنە بەر زۆرەملێ ، ئەم رێچکەیەش بەتایبەتی لەگەڵ عیراقدا بەکاری هێناوە ، رێککەوتن‌و پروتۆکۆلاتی سنوری جۆراو جۆری کردووە ، بەدەست هێنانی رێککەوتن هەنگاوی کۆتاییان نییە ، چونکە پاش ماوەیێکی تر هەوڵی بەرین

کردنەوەی دەستکەوتەکانی دەدات لەبەر ئەوەی رێککەوتننامەکان دەهێڵێتەوە بێ ئەوەی مۆر بکرێ لە لایەن ئەو لایەنانەی کە خاوەن مەسەلەکەن تا پاشان بڵێن بەجێ ناهێنرێ ، رێککەوتنی ساڵی ١٩٣٧ و پرۆتۆکۆلۆتەکانی پێش ئەوە نموونەی یەکەمی ئەم شتەن زۆرەملێشی بەکار هێنا بۆ دەستبەسەرا گرتنی هەر سێ دورگە عەرەبیەکان



سەرەرای غەزوی عەسکەری کە لە ۳۰ تشرینی سالی ۱۹۷۱ دا کردی .

بەلام غەزوی کۆمەلایەتی ، سامناکترە ، ئێران بە شێوەیێکی رێک هەول ئەدات واقیعی کۆمەلایەتی و نەتەوایەتی هاوسێی عەرەبەکانی بگۆرێ تا بتوانێ هێلی هاو بەش و لەیەک چو یا کلکایەتی دروست بکات ، مەبەستمان لەمە ئەو کۆچە بەشەری و سەرمایەداری فارسییەیە بۆ هەرێمەکانی تەنگاوی عەرەبی تا بیانکاتە فارس و پاشان داوایان بکات ، بەتایبەتی پاش ئەو نۆچ دانەی ئێران کە نەیتوانی بەحرین بگرێتە خۆی .

لێرەدا باسەکە لەسەر مێژووی سنوری عیراق‌و ئێران کۆ دەکەینەوە و هەول ئەدەین رۆشنایی بخەینە سەر ئەو ناکۆکییەی عیراق‌و ئێران‌و هەلویستی هەریەکیان ئاشکرا بکەین .

## پەیوەندییەکانی عیراق‌و ئێران :

پەیوەندی دەولی کە ولاتێ بنیاتی دەنێ رەنگدانەوەی سیاسەتی گشتی‌یەتی‌و بەجێ هێنانی سەرنجییە بۆ دەورو بەر ، ناتوانین لێرەدا بە درێژی باسی مێژووی پەیوەندی عیراق‌و ئێران بکەین بەلام دەستنیشانی دوو خالی گرنگ دەکەین ئەویش بە کورتی جیاوازی سیاسەتی عیراق‌و ئێرانە و شێوەی پێکهێنانی بنەرەتی‌و هاندەرە بۆ ناکۆکی عیراق‌و ئێران .

### ۱ ـ جیاوازی سیاسەت :

گومانی تیادا نییە رادەی نزیك بوونەوە لە پێکهێنانە سەرەکییەکانی سیاسەتی دوو ولات بەتایبەت گەر هاوسێ بوون کارێکی گرنگ دەکاتە سەر بنیاتی پەیوەندی نێوانیان ، بینیمان جیاوازی هەردوو رژیمی عیراق‌و ئێران لەسەر دەمی شادا هەردوو ولاتی گەیاندە ئاستی جەنگ ، گەر بەیەکدا چوونی زرونی دەرەوە و دور بینی سەرکردایەتی عیراقی نەبوایە نە دەتوانرا بکەنە

رێککەوتنامەکەی سالی ۱۹۷۵ ، عیراق بەهیوا بو رژێمی نوێ ئێران تێ‌بگات و زال بێتە سەر هەموو شتە قورسەکانی رژێمی پێشووی لە پەیوەندی‌و سیاسەتی دەرەوەی ، بەوەی رێز لە

رێککەوتنە دەولی‌و گشتی‌و جوتەییەکان بگرێ بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی بە سیادەی هەرێمایەتی و هاوسێیاتی و خۆ تێ‌هەلنەقورتانە ناو کاروباری ناوخۆیی ولاتانی تر ، ئەوەی کە پالپشتی ئەم هیوایەی عیراق بو بۆ پەیوەندی لەگەل ئێراندا ئەو گشتە یارمەتییە بو کە عیراق دەیدا بە موعارەزەی ئێرانی لەسەر دەمی شادا ..

عیراق لەسەرەتادا لە زرونی ئێران گەیشتبو و باوەری بە رژێمی نوێی هێنا و بانگی کرد بنیاتی پەیوەندی نوێ‌و پەرەپێ دراو دروست‌بکەن لە بۆتەی ئەو نزیك بوونە هاو بەشە زۆرانە ، کە نەك تەنها پەیوەندی ئێران‌و عیراقی بتەو دەکرد بەلکو کاری دەکردە سەر پەیوەندییەکانی عەرەبی‌و ئێرانی ، بەلام بەداخەوە ئەمانە هیچی نەبو چونکە

کار بەدەستە نوێیەکانی تاران بەردەوام بوون لەسەر بەکار هێنانی هێزو هەرەشەو و بینینی دەوری پولیس ، بەجۆری گەر پیویستی‌کرد ( وەك خۆیان دەلێن ) تەسدیری شۆرش بکەن . بەم شێوەیە سیاسەتە بۆگە نەکەی شاو کەش‌و فشەرەگەز پەرستانەکەی لە لای کاربەدەستە نوێیەکان بەردەوامی وەرگرت ، هەر بەهەمان

شێوەی سەردەمی شا کە دەست بەسەر دەسکەوتە نا شەرعییەکان بگرن‌و بەپێچەوانەی رێککەوتنەکانی سنوری بجولێنەوە و فارسەکان بنێرنە هەرێمەکانی تەنگاوی عەرەب و دەست لە کاروباری ناوخۆیی ولاتانی دەورو بەر وەردەن .

لە لایەکی ترەوە سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوەکانی بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە عەرەبستان‌و کوردستانەوە هەیە رەنگی لە پەیوەندی عیراق‌و ئێراندا داوەتەوە . لە کاتێکدا

کوردەکانی عیراق هەموو مافێکیان لە بۆتەی ئۆتۆنۆمییێکی پەرەسەندوودا هەیە ، کەچی کوردەکانی ئێران لە پێناوی مافە رەواکانیاندا ئەوپەری زولم‌و زۆر و چەوساندنەوەو ئاوارەیی دەبینن . عەرەبستان ـ یش چەوساندنەوەو هەولدان بۆ کردنیان بە فارس بەردەوامە ، هەر لەو سەردەمەی شای پێشو داگیری کرد لە سالی

١٩٢٥ دا لەگەڵ ئەمەشدا عەرەبستان ناسنامەی خۆی ون نەکردووە و ئارەزوویان بۆ سەربەستی دانەمرکاوە ، کە هەمیشە پەیوەندی خزمایەتییان لەگەڵ عیراقیەکاندا هەیە و دەشبێ لە کاتی ناسۆریدا لە بیر نەکرێن ..

## ٢ ـ ئەو هاندەرە نزیکانەی ناکۆکی عیراق‌و ئێران :

سیاسەتی فارسی توشی نۆچ دادان هات لە کاتی تەتبیق کردنی پەیوەندی نێوان عیراق‌و ئێران . لەسەر ئاستی سیاسەتی سنور فارسەکان قایل نەبوون دان بەو سنورە دیاریکراوی رێککەوتنامەکەی جەزائیر بێنێ ،

هەروەها قایل نەبو ئەو زەوییانە کە دەکەوێتە ژێر سیادەی عیراق بیگەرێنێتەوە ، هەروەها بە پێچەوانەی ئەو پرۆتۆکۆڵە تایبەتی‌یەی کە پەیوەندی بە ئاسایشی سنورەوە هەیە ئەویش بەوەی یارمەتی هەندێ کۆمەڵێ لە کوردە بەزیوەکان دەدا کە لە سنورەوە ئەهاتنە ناو عیراقەوە ، هەروەها بە هۆی کرێگرتەکانییەوە کاری وێرانکاری دەکرد و هەوڵی ئەوەی ئەدا عاباتی لەم بابەتە دروست بکات بۆ بەجێ هێنانی ئەم شێوە کارانە .. فارسە رەگەز پەرستەکان

ئەم هەڵویستانەیان بەتین تر دەکرد ، سەرەرای ئەو گشتە داخوازی‌و داواکاری‌یەی عیراق بۆ پێکهێنانی پەیوەندی چاك لەگەڵ رژێمی تازەدا ، کەچی تەعەداکانی ئێران زیاتر دەبو و زیاتر تەسریحیان دەدا کە رژێمی عیراق بگۆرن و هەموو رێککەوتنامەکانیشی خستە پشت گوێوە .

لە کتیبێکدا کە وەزارەتی راگەیاندن چاپی کردووە زنجیرەیەك لە دەست درێژی و تەعەدای ئێرانی باس دەکات کە کراوەتە سەر دەزگا رسمی‌یەکانی عیراق لە ئێراندا و زندان کردنی کەسانی جالیاتی عیراقی و پێکهێنانی خۆپیشاندانی

دژ و یارمەتی دانی هەندێ کۆمەڵی دژ بە عیراق و کۆکردنەوەی پیتاك بۆ ئەو شتەی گوایە پێی دەوترێ شۆرشی ئیسلامی لە عیراقدا ، هەندێ فەتوا و تەسریحاتی دژ ، هەندێ لەو

فەتوایانەش کە گوایە سیادەی فارسی بەسەر عیراقەوە هەیە یا بەسەر بەشێکی . هەروەها کتێبی ناوبراو بە ژمارە دەستدرێژیە سوپاییەکانی ئێرانی دەرخستوە بەسەر مەخفەرەکانی عیراق‌و گەمی‌یەکانی عیراق لە شط العربدا هەروەها

دەستنیشانی مێژووی تەعەداکانی ئێرانی بەهۆی فرۆکە جەنگی‌یەکانیەوە کردووە کە حورمەتی ئاسمانی عیراقیان بریوە کە لە نێوان ١٩٧٩/٢/٢٣ تا ١٩٨٠/٥/٢٦ پەنجاو چوار جار تەعەدای کردووە .. بەمیراتی خۆفشەوە کردن‌و

هەرەشەو گورەشەی فارسی گوازراوەتەوە بۆ ئەمان بێ ئەوەی کە پێویستی دەکرد دەورەکانی مێژوویی سنورێ بۆ ئەم شتەیان دانێ لەگەڵ ئەمەشدا دەبو دوو رژێمی جیاواز لە سیاسەتیان بە ئاسایشەوە بژین گەر ئەو گشتە تەعەدا خەستانەی رژێمی فارسی رەگەز پەرست نەبوایە

کە شێوەیێکی وەرگرت وای دەنوان نەك هەر سورن لەسەر ئەوەی کە دان بە مافەکانی عیراق نەنێن لەسەر ئەرزی خۆیان بەڵکو خۆیان ئامادەی جەنگێکی فراوان کردبو بۆ سەپاندنی ئەمری واقع . ئیتر عیراقی سەر بەرز لە لایەن خۆیەوە رێککەوتنەکەی سالی ١٩٧٥ ی هەڵوەشاندەوە کە ئێران پێش ئەمە خستبویە پشت گوێوە . ئیتر

ئەوە بو بۆ بەرگری لە مانی رەوا جەنگ دەستی پێ کرد پاش ئەوەی عیراق چەند جارێ ئینزاری ئێرانی کرد کەچی ئەمەشیانی هەر خستە پشتی گوێوە .

## داهاتووی پەیوەندی عیراق‌و ئێران :

ئەگەر ئێستا نەتوانین بەوردی خەملی پەیوەندی داهاتووی نزیکی عیراق‌و ئێران لێدەین، بەلام بە دلنیاییەوە دەڵێین سەرکەوتن‌و سەربەرزی بۆ سوپای عیراقی بەجەرگ‌و میللەتی

دلێر و سەرکردایەتییە مێژووییەکەی لە ژێر ئالای سواری بەجەرگ صدام حسین ـ ە و لەبەر رۆشنایی ئەمەش بریاری هەموو شتەکانی تر دەدرێ .. وەکو میللەتێ خێر بۆ هەموو میللەتان دەخوازین .

# بۆ چاوەگەشەکانی مەهاباد

شێرزاد عبدالرحمن

لەپێناوی خاك ، لە پێناوی بستێك خۆڵ سەد کۆشکی لەتۆ گەورەتری رووخاند ، سەد مل

شۆری وەك تۆی بەرامبەر بە مێژوو رووت کردەوەو کە کەللە سەری بڕا ، گریان بەردایە لاشەکەی ...

لەسەرخوێنی خەڵك سفرە دادەنێی ، بەخوێن دەژی ، بەخوێن هاتیتە سەرتەخت ، بەڵام‌نەك بەخوێنی خۆت ، نەك بەخوێنی گەش‌و ئاڵ ، بەڵکو بەخوێنی رەش ....

بەڕیشە هەڵخەڵسەتاوەکەت ، ئاگرت لەمێژوو بەردا ، شەقامەکانت کردە گۆڕستانی لاوان ، پێ‌کەنیت ، کە لاوێك تیرە باران دەکرا ، زەردەخەنە داتێ ئەگرت ، بەخوێنی گەش ئەتدایە قاقای پێ‌کەنین ... فرۆکەت بەردایە شارو لادێ ، ووشەی « سەربەستی »ت لەبیر خۆت بردەوە ... نازانی دەتەوێ میللەتێك بکوژی ، کە منالە قشتیلەکانی ئامادەن بەدارلاستیك ، بەبەردی بچووك رووبەرووی فرۆکە ببنەوە .. هەرچەندە خوێنی گەشیان بەبەردو دارلاستیکەکانەوە بنووسێ ، منالانی‌تر ، سبەی لەبەردەم خوێن گەشی ئەوان گۆرانی نەورۆزێکی تر دەڵێن‌و ریشی تۆ دەسووتێن‌و لاشەکەت فرێ دەدرێتە سەرشەقام ... مرۆڤ لە وولاتی باوەڕدا ، هەڵوێستی گەورە دروست دەکاو تۆش زیاتر نی لە بەندی مێژوو ..

بەدەستە چەپەڵەکانت ، بێ ئەوەی لەمێژوو بترسی ، پەتی سێدارەت خستە ملی چەندەها لاوی جگەر سۆزی کورد ، بۆ ئەوەی وێنەیەك دروست کەیت کە لەم‌ولەولای شەقامەکان پیاوە ترسنۆکەکانت مرۆڤ تیرەباران دەکەن ..

کەللەسەری سەدەها منالی بێ‌تاوانت خستە ژێرپێ ، دەیەها دایکی جگەر سووتاوت لە ماچێکی قوولی رۆلە ئاوارەکانیان بێ‌بەش‌کرد و ئاگرت بەردایە ئەو شارە تێنووانەی بۆ چرپەیەکی سەربەستی دەسووتێن .

سەد دەنگی زوڵاڵت کپ‌کردەوە .. زەردەخەنەت لەسەر رووی منالی بێ‌تاوان لابرد .. تۆزقاڵێك ئاوڕت لەو مێژووە نەدایەوە کە سەد دڵی بێ‌خورپەو دەروون ڕەشی ریش بەچڵکی وەك تۆی خستە تەنەکەی مێژووەوە ... وستت قۆڵی « مەهاباد » ببەستیتەوە ، نەتزانی لەوەتەی مەهاباد هەیە ، هەر ئازار ڕاودەنێ‌و بەرەو رووی سێدارە دەچێ‌و سێدارە لەترسی چاوە گەشەکانی ئەو ڕادەکات .. نەتزانی ئەو تنۆکە خوێنەی لە دڵی مرۆڤێکی کورد دەچۆڕێ ، ئەوتنۆکە گەورەتر دەبێ‌و ، بەدرێژایی مێژوو دەبێ بە رووبارێکی مەزن .. ئەستێرەی شەوە تاریکەکانی تیا ئەدرەوشێتەوە .

بێ بەزەیی ، بە روورەشی‌ی ، بەربوویتە گیانی زیاتر لە میللەتێك ، قین‌و کینەی خۆت بەچۆك‌شکاندنی ئینسانی بێ‌تاوان دامرکاندەوە ، بەڵام ئینسان ، لە وولاتی ئاگرو نەورۆز ، دەبێ بەشۆڕش‌و شۆڕشیش تەقینەوەیە .

بیر لەوە ناکەیتەوە ، هەر هاواری ئینسانە،

# بەیادی ئۆتۆنۆمی یەوە

**سەردەمێ بوو گەلی کورد لە مافە نەتەوایەتی یە رەواکانی و لە ژێر سێبەری چەندین رژێم و حکومەتی کۆنەپەرستی بەر شۆڕشی ١٧ – ٣٠ تەموزی پیرۆز ئەتلایەوە . کێشەی کوردیش یەکێ لە ئالۆزترین گیروگرفتێ بوو کە روبەرووی شۆڕش بوەوە .. بۆیە کە سەرکردایەتی سیاسی بایەخێکی زۆر زلی پێدا ، ئەمیش لە سەرشاری مەبدەئە مرۆڤایەتیەکانی خۆی و تێگەیشتنی ئەو کێشەیە لە هەموو لایەنێکیەوە . ئەو کێشەیەی کە گەلێ جار لەلایەن هێزەکانی کۆنەپەرستی و ئیمپریالیزمی جیهانی و لەپێناو بەرژەوەندیەکانیان ئەیانخستە کار و سوودیان لێ وەر ئەگرت . راپۆرتی سیاسی سەر بەکۆنگرەی هەشتەمی هەرێمایەتی حزبی بەعسی سوشیالیستی عەرەبی سالی ١٩٧٤ لەم بارەیەوە بەئاشکرایی وتویەتی : کە بزوتنەوەی کوردایەتی لە عیراق ، سەرباری هەموو روکارە مێژوییەکانی و گەندەڵەی کۆتەپەرستیش ، لە بنچی جەوهەردا بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی یە و لە سنوری داخوازیە نەتەوایەتی یە رەواکانی خۆی بۆ گەلی کورد لە چوارچێوەی کۆماری عیراق و بەتایبەتی ئۆتۆنۆمی زۆر راست و دروستە ) .. هەروا راپۆرتەکە دەسنیشانی ئەوەیشی کردبوو کە : ( حزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب ، حزبێکی نەتەوەیی و سۆشیالیستی و دیموکراتی یە . بۆیە کە ئەبوایە بەوردی لە مافە نەتەوایەتی یە رەواکانی کورد بکات .. کۆمەلانی خەلکی کوردییش ئەبێ خەباتی بێ ووچان بۆ دابین کردنی ئەو مافە بگێڕێ .**

جا لەبەر ئەوەی ئەم حزبە سەرکردایەتی دەسەلاتێکی شۆڕشگێڕانەی ولات ئەکات ، هەر لە ١٧ – ٣٠ تەموزی ١٩٦٨ وە ، بۆیە کە مەسئولیەتی بنەڕەتی بۆ دەستەبەرکردنی ئەو مافانە ئەکەوێتە سەرشانی ئەمەوە ، ئەمیش لە رێگەی چەندین سیغەیەکی دەستوریانەو قانونیانەی و ئیجراناتەوە . هەروا ئەو رێبازە بنەڕەتیەو چەسپاوەی کە حزب گرتویەتیە بەر بۆ دەستەبەرکردنی ئەو مافانە . هەربۆیە و بەر لە دەرچوونی بەیاننامەی ١١ ئادار لە بارەی مافە رۆشنبیریەکانی گەلی کورد و مافی فێربوون بەزمانی خۆی و دامەزراندنی گەلێ دەزگای رۆشنبیری و بایەخ پێدان و پشگیری کردنیان جێ بەجێ کرا . بەلام ئەو دەسکەوتانەی کە دوای بەیاننامەی ١١ ئاداری سالی ١٩٧٠ رەنێو هێنرا ، بارو دۆخێکی تایبەتی بۆ گەلی کورد خولقاند و چەندین دەسکەوتی وای دەسکەوت کە لە ژێر سایەی کۆنە رژێم و حکومەتەکانی پێشوو بەدرێژایی مێژووی خۆی نەیدیبوو ...

**لە بواری رۆشنبیریدا ، گەلی دەزگای رۆشنبیری و پەروەردەیی ، وەك : بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردی و بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری کورد کە لە پاشا بوو بە دەزگایەکی فراوان و لە ژێر ناوی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردیا هاتە ئایە ، هەروا زانستگەی سلیمانی و کۆڕی زانیاری عیراق – دەستەی کورد – و گەلی دەزگای رۆشنبیری تریش ... ئەو دەزگایانەش گەلێ گۆڤارو رۆژنامەی رۆشنبیری و ئەدەبی جۆێ جۆێ یان دەرکردو بەشداریەکی بەبایەخیشیان لە پەرەپێدانی بزوتنەوەی رۆشنبیری و ئەدەبی گەلی کورد کرد ..**

بۆ بەردەوام بوونیش لەسەر ئەو رێبازو لە ئەنجامی وەفاداری شۆڕش و پەیمانەکانی ، ئەوە بو لە ئاداری ١٩٧٤ و وەکو دەسکەوتێکی گەورە ، قانونی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد جاڕدرا و دەزگاکانی لە ناوچەی کوردستان جێگیر بوو و یەکەم ئەنجومەنی یاسادانان لە سەرەتای تشرینی یەکەمی سالی ١٩٧٤ دا کرایەوەو هەروا ئەنجومەنی راپەڕاندن و ئەمینداریە گشتیەکانی لە مەودایەکی کورتا جێبەجێ و تەواوکراو کادیری تەکنیکی و ئیداری بۆ هەلسوڕاندنی ئەو دەزگایانە تەرخانکرا ...

ئەمرۆش کە هەڵوەستەیەك لە بەردەم یادی بانزە سالەی جاڕدانی بەیاننامەی ئادارو راهێنانی ئۆتۆنۆمی ئەکەینەوە کاتێ کە بەو سالانەدا ئەچینەوە ، ئەبینین کە گەلێ دەسکەوتی گەورەو مەزن ، بۆ گەلی کوردو لە هەموو بوارەکانی ئابوری و کۆمەلایەتی و پەروەردەییا جێبەجێ کراوەو لە هەمان کاتیشا راپەڕینێکی فراوان و شارستانانە رەنێو هاتوە ...

**ئەم تەجرەبەیە پێشەنگەیش بەردەوام ئەبێ بەسەرچاوەیەکی گەورەی خێرو بەخشش و پاشەرۆژێکی رووناك و بەختەوەر بۆ گەلی کوردی ئیمە .**

جەباری حاجی کەریم

# نەورۆز..! سەرمت پێ دەبەخشم

هۆ ئەم ساڵیش چاوەڕێت بوو .. چل ڕۆژ لە پێش و دواتەوە زەماوەندی تەنکە نانە .. نەورۆز هەی دەردت لە گیانم چیای بەمۆت ناوەتە پاشکۆی خۆتەوە ، سواری ڕۆژی ئەم ساڵ بووی .. ئەستێرەت کردۆتە زین و بەرەی دەم ئاوزەنگی سنگی چارەوێ کەتەوە .. سیروانت کردۆتە بەرو وەنەوشەت لە جیاتی مشکی پێچاوە لە سەری خەمی ئاڵپەتەوە .. هۆز هەڵپەڕکێی هەزار ساڵەی لەم ڕۆژەدا دەگرێتە سەر .. منداڵێکی دەست و پەنجەی ئەم چیایە پێ نازانم سەعاتی هەڵنەگرتبێ .. ئەوەندەیان گۆرانی بۆ ئاڵاوی پشکۆی سەری بێ ڕەنگت دا بە با .. تا هەموویان بوونە پشکۆ .. ئەوەندەیان پرچی خۆر گرت ، تا وەك خۆت جوان بوونە ئاگر .. نەورۆز بەزاوەی ئەم ساڵت بۆ کێ دەبێ ، لە کوێ دەبێ ! ئەتێبێکت بۆ هێناوین هەموو بەرەبەهارێکی ڕووبارێکی ئەم کوێستانەی لە گەرووا حەشارداوە ..



نەوروز جلەوی خۆر شل کەو بە سەر ئــەم توولە ڕێیەدا تا ســــــەر برۆ .. لــەوێ گــەر کاسەسەرێکی سەوزت بینی ، تیر لە ئاوەکـــەی بخۆوەو بیدەرەدەستی چیاکەی پاشـــکۆتەوە .. ئەوە کۆرپەی ئاسۆیەك بوو نەوروزی پار خۆی لە خوێنی ئاهت ژەندو بە دواتا هات .. بروسکەیەك چارەوێی بوو ، نیشتە گیانی خۆیی‌و خواردی.. ڕەوە کەوێك لاشەکەیان بۆ ئەو جارە هێنایەوە .. وا هەزار سالی ڕەبەقە نێرگز ســــــەری خۆی دادەنێ‌و پێشی‌ناگا .. ئەی نەوروزی ووشـــــەی بەهار ، ئاخۆ ئەم سالیش وەکو پار تەنێ ســالێ تویشووی ماندووی هەوار دەبی ! تەنێ ســـاتێ ژینۆی سەوزی هەژار دەبی .. ! کورد لە گیانی تۆدا نەبێ بە خوای خۆیان ناگەنەوە.. بە گەرمایی سۆزت نەبێ دلێ چیا نادەنەوە .. نەوروز تا کەی دێیت‌و دەڕۆی ! شاعیر نەما هەزار شــــیعری بۆ بالای تۆ .. نەدابێتە دەستی پشکۆ .. ڕۆژێ نەمدی سیروانەکەت تووڕەبێت‌و ڕێچکەی سۆزی بۆ ئــەو کێـــوە ، بێنێتـــەوە .. تــا کــەی دێی‌و دەڕۆیەوە .. چیا ســـەری ئەوی دی خوارد .. ڕووبار سەری دەریای بڕی .. ووشەی بەفـــــر کۆچی کردو ئەو خوارانەی کردە بەرمال .. تــۆ هەردێیت‌و شیعرت دەوێ .. ئەم سال بەم جۆرە بێیەوە .. مەگەر گلکۆت بچنی‌یەوە .. نەوروز ! بست بە بستی ئەم کوێســـتانە ، چاوەڕوانە .. جلەوی ڕۆژت لە دەســـت بگرن .. چاوت لێیە ئەو کێوانە ، بۆ ـ زاوایی بووکی ئەم بەرەبەیانە ، لە نێو گردا مەلە دەکەن .. چاوت لێیە بنـــاری سەختیان لە سەرناوەو بەرەو کلپەت ڕێ دەکەن‌و دەیانەوێ تێر بلێســـەت بخۆنەوە .. نەوروزەکــەم فەزاوەگێڕی بالات بم ، کــــە دێی بۆمــــانەوە وەرە .. کە هاتیشی بمنێ پاشکۆت با منیش وەك



ئەو چیایە بێ لە ناو گڕتا داکــوتم .. گەر بێت‌و شەرم گڕپۆشی بالات نەکـــەم کــەی دەبێ بلێم چیاییم ، ئەی چۆن لە زمانی بەرد دەگـــەم .. نەوروز پیرۆزبایی ئەم جارەشت لە کوردان بێ .. رەوی زماوەندی بورکان دەکاو ، منیش سەرمت پێ دەبەخشم .. تۆش لە چۆڕاوگەی ســووتانت بەهـــار دەبەخشــــی‌یە منـــدالی پەروەردەبووی وەنەوشەی دەم بناری ئەم کوردستانە .. نەوروز کا دێی ئاگات لێ بێ .. چیایی‌یەکان چل ڕۆژ لە پێش‌و دواتەوە شـــــایی بۆ تەنکە نان دەکەن .. ڕووبار بۆ دەم کەلگە دەبەن .. ئاســـۆ لە لوتکە ڕۆند دەکەن .. ناسکە شــــیعریش لە بەرتەوە هێشووە ووشەی تیشك دەگرێ‌و هەناســــــەی گەرم‌و کولاوی گەلەکەت .. هەر وەکو پژوێن .. لە کەمەری ئەم گەردوونە گرێ ئــەدا ، نەوروزی خوێن .. !

٢٢-٢-١٩٨١ بەغدا



# بەرەو نەورۆز

— ١ —

هەموو ساڵێ
لەدەشت یاخود لە گشت ماڵێ

درشتو ورد
ئاگری نەورۆزمان خۆش کرد
بەرگی نوێمان بۆ دەپۆشی
چاوەی تەقیومان دەنۆشی
نیرگسمان دا لە بەرۆکمان
هەڵپەڕین تاشل بوو چۆکمان
شەو تا بەیان
هەزاران پشت لە کوردستان
بەدەوری کلپەی ئاگردا

گۆرانی بوو
پێکدانی وشەی جوانی بوو
جەژنە پیرۆزەی پڕ بزە .. لەیەك دەکرا
ئەژدەهاکی گیان دەرهێنەر
لە ترسی گەلی یەکگرتوو
بروای بۆ ترس هەرگیز گەردن .. کە چ نەکردوو
ناتوانێ سەر بێنێتە دەر

— ٢ —

هەموو ساڵێ
لەپیر هەتاکو منداڵێ
بە ئاشکراو بەنهێنی
گڕی نەورۆزی دەبینی
زستانی ژوورو گرێوە
مەرگی سەختی هابەرێوە
دەشتو دەر گیاو گوڵو دارە



خۆر پڕ ئاسمانی نازداره
باڵداری شۆخی هێلانه
سەربەست دەفڕن بۆ کوێ جوانه
وەك پۆلی سەیرانکەری دەشت
کام لا چن دەیکەن بە بەهەشت
ئەم جوانیانە وا یەك بگرن
هێزەکانی ناشیرینی دەبێ بمرن

— ٣ —

هەموو ساڵێ
لەگشت هەردەو ملەویاڵێ
بەرەوویەکی پیرۆزەوە
دەچوین بەپیر نەورۆزەوە
هەرچەندە تاڵی چێژ رابێ
سەر سنگ بەمەرگ پێژرابێ
کاروانی گورجو رێ کەوتوو
سەر بەرزانە سڵ نەکردوو
تا باوەشی نەکردایە
بەو رۆژی شۆخو شەنگا
کام هێز رێگەی بگرتایە
دلێرانە .. بێ‌ترس بەرووی‌دا دەجەنگا

مجید ندیم

* * *

ئەی نەورۆزی تاقانەی کورد
ئای کەرۆژگارت بەسەربرد
چەندجار پەت خرایە بنینت
بووبەخەڵوز پێکەونینت
لەگەڵ ئەمانەش‌دا ئەمرۆ
دەبینم تۆ
لەجیاتی ئەوەی کە پیربێ
ترساوێکی گۆشە گیر بێ
ورد ورد ملی رێی گۆڕ بگری
چاوەڕوان بیت ساکەی .. دەمریت !!
کەچی ئەمساڵ
لەپار پەرداخترو جوانتر
بە بزەو وشەی رەوانتر
وا دەگەیتە بەردەرگای ماڵ

* * *

جا کە تۆ یەك خوێنی کورد بێ
گیانو ژینی گەورەو ورد بێ
ساڵ بەساڵ خۆشەویستر بێ
لەنانو ئاو پێویستر بێ
رۆژێك دێت جوانی‌یەك بگرێ
باڵی فرینت بەر بدرێ .



■ لێکۆڵینەوە





# گفتوگۆیەك لەوەرشەی نووسەردا

■ انور قادر جاف

**ئالین بۆسکی « فەرەنسا »**

**یێفگێنی یەفتەشێنکۆ « یەکیەتی سۆڤیەت » .**

- به بێ شیعر ناتوانین بژین

بۆچی خەلکێکی کەم لە فەرەنسا حەز لە شیعر ئە

- ئەدەبو ئەخلاق

- دە کەس لە هەرە ڕۆمان نووسە باشەکانی دنیا

یەفتەشینکو :

من وا هەست ئەکەم کە فەرەنسایی یەک
کەمتر دیوانی شیعر ئەکڕن و بە چاکیش شا
شیعری خۆیان نین ، رەنگە ئەم بۆ چوونەی
ڕاست نەبێت ، ئەی ئەبێ هۆی چی بێ ؟!
شیعری فەرەنسایی بێ بڕشتە ، یا خەڵکەکە
لە شیعر ناکەن ؟! ئاخۆ ژمارەی کتێ
( ڕامبۆ ) و ( ڤێرلین ) و ( ئیلوار ) لە و







خۆیدا چەندیان لێ چاپکرابێ‌و ئەتوانین لەگەڵ بەرهەمی شاعیرە نوێیەکانی ئێستادا بەراوردیان بکەین ؟!

**ئالین بۆسکی :**

تۆ چاك بۆی چوویت ، لای ئێمە خەڵکێکی کەم ، چەند سەد کەسێ ، شاعیرە هەرە نوێکان‌و دوو هەزار کەسێکیش بەرهەمی شاعیرە ناسراوەکان ئەخوێننەوە .. ئەمە گیروگرفتێکی تازەی ئێمە نیيە ، راستیيەکەی شیعری فەرەنسی لە دوو قۆناغدا برەوی تەواوی لای خەڵك هەبووە، لە قۆناغی رۆمانسیەتدا لە سالانی ١٨١٠ – ١٨٣٠دا ، لەو رۆژگارەدا کە ( ڤیکتور هۆگو )و (لامارتین)و ( ڤینی ) بە شیعرە تەڕو ناسکەکانیان ، توانیان سەری نەوازش بە جەماوەر دانەوێنن‌و سەرنجی جەماوەر بۆ شیعر ڕابکێشن‌و دوای ئەمەش لە سالانی ١٩٤٠ – ١٩٤٤ دا ، کاتێ نازییەکان وڵاتەکەیان داگیرکردبێ ، شیعری بەرگری‌و بەرهەڵستی کردن لە سەر دەستی ( ئیلوار ) و ( ئاراگۆن ) و ( پیرا ئیمانیولا ) دا ، بووە ویردی سەرزاری جەماوەر . سانسۆری ئەڵمانی ئەوەندەی دەرۆستی پەخشان ئەهات ، هی شیعر نەئەهات . لەم دوو قۆناغە بترازێ هەمیشە خەڵکێکی کەم لای ئێمە خنەی داوەتە شیعر .. ئاشکرایە ( رامبۆ ) لە ژیانی خۆیدا چاپخانەی بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانی چنگ نەکەوتووە .. دێتە بیرم سالی ١٩٣٨ کتێبکی ( ئیلوار )م کڕی کە لە ١٩٢٢ دا دەرچووبوو ، تیراژەکەی ( ٢٥٠٠ ) دانە بوو تیراژی دیوانە شیعر لەمە زیاتر نەڕۆیشتووە . لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکێکی کەم هەوا خوای شیعرن ، بەڵام شیعرێکی ئێجگار شیرین‌و دەوڵەمەندمان هەیە ، ئەم دیاردەیەش هۆی خۆی هەیە .. شیعری فەرەنسی دووای ( بۆدلێر ) و ( مالارمیە ) ، پێی ناوەتە قۆناغێکی مەشق کردن ( التجريبية ) و پێشرەوانەوە .. زمانەکەی قورسەو خوێنەر ماندوو ئەکات . نەك هەر ڕەشە خوێنەوارەکە بەرەی مام ناوەندیش یارای ئەم خۆماندووکردنەیان بە شیعرەوە نیيە .. چەنێ شیعر لەوە دوورکەوتۆتەوە کە ماقوڵ‌و کۆمەلایەتی بێ ، ئەوەندەش بە پێویستییەکی ئەوتۆی زیندووی ژیان نازمێردرێ .. ئەتوانین لە دە شاعیر نۆیان بە سادەلەوح‌و بیرتەسك ناوبەرین . لە لایەکیترەوە ، خوێنەری ئەورووپا لای‌وایە شیعر ئەوەندە بێتاقەتی دەرکەری مرۆڤیش نیيە .. دیسانەوە ئەمەش دوو هۆی گرنگی هەیە، یەکەمیان پەیوەندی بە دەورویشتەوە هەیە ، بەوەوە کە خەڵك هەست ئەکەن شیعر ئەو بازارەی نیيەو ئەرکێکی‌وای نیيە بیگرێتە ئەستۆ .. چونکە

•

فەرەنسا لەچاو جاراندا – جگە لە گیروگرفتی بێکاری – سالانێکی هێمن‌و ئارام ئەژی‌و شیعریش چ نەریت‌و قیمەتێکی تازە نیيە بیدۆزێتەوە .. جگە لەمەش ئێمە لە هەموو مەیانێکا خاوو خلیچك‌و تەمەڵین. هۆی دووەمیش ئەوەیە ، دەزگای پڕوپاگەندەو ڕاگەیاندنی جەماوەریش داکۆکی لە شیعر ناکاو لای‌وایە لە گۆرانیدا ئەژی ...



بە ڕای من هەڵەیە ئەگەر ( ژاك‌بیرێل ) كە لە هەموویان باشترە یا ( ژۆرژ برەسانس ) یا ( شارل ئازناڤۆر ) بە شاعیری تەواو بزانرێن ، كەچی بەپێچەوانەوە میللەت هەر ئەوانە بە شاعیر ئەزانێ .. بە تێ‌بینی‌یەك كۆتایی بە وەڵامی ئەم پرسیارەم ئەهێنم‌و ئەڵێم : ئەو شاعیرانە ئەیانەوێ زمانێكی تازەی دوور لە زمانی شیعری كلاسیك دابهێنن‌و ئەمەش زیاتر بەرهەمەكانیان تەم‌و مژاوی ئەتاو بەرەو ئەوەیان ئەبات خەڵك لێیان تێ‌نەگات ..

**یەفتەشینكۆ :**

ئایا مرۆڤێ كە شیعری خۆش‌نەوێ ، ئەتوانین بە مرۆڤێكی تەواوی دابنێین ؟!

**ئالین بۆسكی :**

مرۆڤێكی شارستانی بە بێ‌هونەر ناتوانێ بژی . هونەر مرۆڤ ئەگەیەنێتە كەماڵ‌و شتی نادیار ، وای‌لێ‌ئەكات بە جۆرێكی شیاوتر خۆی ببینێ . مۆسیقا بە بێ‌وشە ئەیخاتە جۆش‌و خرۆش ، ڕەسم وای لێ ئەكات هەستی‌بهەژێنێ‌و لە ئەبەدیەتە دوورەدەسەكە نزیكی بخاتەوە . هەموو ئەمانەش پێویستە فۆرمێ بگرنەخۆ . ڕەنگە شیعر یەكسەر هەست نەجووڵێنێ . شیعر لەبەرئەوەی بە وشە دەرئەبڕدرێ ئەركی قورسترە چونكە خوێنەر ئەبێ چاك بیخوێنێتەوە هەتا لێ‌ی تێ‌بگاو بزانێ لە چ قالبێكی هونەریدا داڕێژراوە .

شیعر پێویستی بە هۆش‌و زەین هەیەو بە بێ خوێندنەوەی قووڵ‌و تێگەیشتن ، چێژ لێوەرگرتنی ئاسان نی‌یە ..

**یەفتەشینكۆ :**

دووای ڕۆیشتنی شاعیرانی هەڵكەوتووی جیهانی وەك ( سان‌ژۆن پێرس ) و ( ئیلیۆت ) و ( ئۆدن ) و ( پاسترناك ) و ( نیرۆدا ) ، زۆركەس لایان‌وایە لاوەكان ناتوانن جێگەیان بگرنەوە ، تۆ ڕات چی‌یەو ، هەڵكەوتنی شاعیرانی دانسقەی وەك ئەوان بە چی لێك ئەدەیتەوە ؟! پەیوەندی بەمێژووەوە هەیە ، بە پێشكەوتنی زمانەوە ، بە باری دەروونی خەڵك‌و مرۆڤایەتی‌یەوە ، بە چی‌یەوەو تۆ چۆنی تێ‌ئەگەی ؟!

**ئالین بۆسكی :**

دوای مردنی شاعیرێكی گەورە ، زۆر جار خەڵك ئەڵێن ڕۆی ، ڕۆیشت‌و كەس نی‌یە جێگەی بگرێتەوە، كەچی دوای ئەویش شاعیرێكی گەورەی تر پەیدا ئەبێ .. ڕایەكی‌تر دێتە كایەوە ، كە ئەڵێت ئەم شاعیرەش سا بزانە زادەی چ كۆمەڵە ڕووداوێكی مێژوویی‌یە ، بەڵام بۆ فەرەنسای ئێمە ئەمە ناساچێ ، هیچ پەرجوویەك لەو ڕووداوە مێژووییانەی ئێمە لەدایك نەبووەو پێوەندی پێوە نەبووە . نە شۆڕشی ١٧٨٩ ، نە كۆمۆنەی پاریس ، نە سەركەوتن بەسەر ڤیردینادا هیچ یەكێك لەم ڕووداوانە شوێن پەنجەیان بە بەرهەمی ئێمەوە بەجێ‌نەهێشتووەو تیایا ڕەنگیان نەداوەتەوە . كەچی هەر لە ڕاڕەوی ڕۆژگاردا بەپێچەوانەی لای ئێمەوە شیعری بەرگری یۆگوسلاڤی‌و شیعری بەرهەڵستی‌و گەمارۆدانی لینینگراد زادەی ڕووداوی مێژوویین‌و لەمەدا شیعری ئێمە خەتی ( بۆڕی ) ئەوان نادات‌و پێشیان ناكەوێ .. شیعری فەرەنسی لە كاتی هێمنی‌و ئاسایش‌و سەروەختە بێ‌هەراو هوریاكانی مێژوودا لەدایك‌بووە . لەوكاتانەدا شاعیر ئەتوانێ بیرو هەستو ئەندێشەی خۆی بە چاكی

دەربڕێ . جوانترین شیعری ڕامبۆ لە ١٨٧٣ وە تاكو ١٨٧٥ لەو سەردەمە هیچ‌و پووچە بێ‌بایەخەدا، كە خەڵك شكستی پروسیاشی لەبیرچووبووە ــ نووسراون .. شیرینترین شیعری ( سان ژۆن

پێرس ) له ١٩٠٧ – ١٩١٠ ، له ســــــەردەمی گــەشەسەندنی پڕ لــە ئەدگیی کلۆنیـالیزمـدا نووسراوە . لای ئێمە شیعرێکی ئەمر نیيە کـە بۆ لویـی هــەژدەیــەم ، نـاپلیۆن ، ژۆریس ، یـان دیگۆل نووسرابێ .

**یەفتەشینکۆ :**

بــە ڕای تۆش ســـینەما دەیــەمین ژانری هونەرە ، تەلەفزیۆنیش یانزەیــەمــە ؟! بۆ ئێمەی نووســـەر جێی داخە کـــە کارو تەئسیری ئەم ژانرانە سەد قاتی ئەدەبە . یا وا نیيەو ئێمە وای دائەنێین ؟! ڕاســتە تەلەفزیۆن باری دەروونیی مرۆڤ ئەخەملێنێ ، بەڵام ئایا ئەویش وەك ئەدەب، قووڵایی هەســتو گیان ئەهەژێنێ ؟!

**ئالین بۆسکی :**

من هەر بە سەیرکردن ، ســـــــەیری فلیم نـاکــەم ، من ئەچمە ناویەوەو تیایا ئەتویمەوە . سینەما چاکترین تلیاکی ئەم سەردەمەی ئێمەیە ، ڕێ لە بیرکردنەوە ئەگـرێ ، ئەمە دیـاردەیــەکی فیزیایی‌یەو لەم‌لایەنەوە ئەبێ وریای بین‌و تەرێزی لێ بکەین . ســـــــینەما دەربڕی هونەرەو کارو تەئســــیرێکی زۆریشی هــەیــە . له دنیـــای ســــەرمایەداریدا سینەما ئالەتێکە ئاراســـتەی ئارەزوو و هەستی مرۆڤ‌کراوە . مەکینەیەکە کـە درمی ئەودەنی‌و تەپۆیی‌و مێشك‌و هۆش سڕکردن بڵاوئەکاتەوە. ئەم رایەی من هیچ لە نرخی بەرهەمە بەرزو پڕ لە داهێنانەکانی مامۆســـتایانی وەکـــو ( فیلین ) و ( بیرتولچی ) و ( کوپۆلا ) کەم‌ناکاتەوەو ئەس ناتوانێ گوێ لەو داهێنانانە کـــەڕ بکات . لـــە چاوی نـــەوەو خــەڵکی ڕۆژگاری منــەوە ، تەلەفزیۆن بەری لە تێگەیشتنی قووڵتری فەزاو زەمان گرتووە . هەرچەندە من ســـوپاسگوزاری تەلەفزیۆنیشـــم چونکە من نـــەچووم بۆ تاڤگەی زامبیزو ساخەری کەچی دیویشـــــمن ... من ڕام‌وایـــە تەلەفزیۆن نـایــەڵێ مرۆڤ بــەقووڵی بیربکاتەوەو مێشکی مرۆڤ دەستەمۆ ئەکات .

**بەفتەشینکۆ :**

گەلێ کتێبی بەنرخ‌و پڕبەها نووســــراون‌و هەمووش داوای گوڕانی مرۆڤ ئــەکــەن بــەرەو باشترو دنیایەکی جوانتر ، بەڵام لە جیهاندا هێشتا زوڵم‌و زۆرو چەوسانەوەو جەنگ هەر بەردەوامە. دووربا ! ئەڵێی گوایە هونەر دەستو پێ سپی‌و دەستەوسانە لە بەردەم غەریزەی ڕەشی مرۆڤداو تەئســـــیرێکی ئەوتۆی نیيە ؟! یــان ئەو کتێبە بایەخدارانە باتەقای ئەوە ناکەن‌و ئەگەر بە دەیەها قات زیاتریش بنووسرێن هەر داد نادەن ؟! یــان ئێمە زیاد لە پێویســــــت دەور ئەدەینە ئەدەب‌و ئەخلاقی مرۆڤایەتی هــەر بەمــەوە بەند نیيــە ؟! جا ئەگەر ئێمەی نووســـــەر ، ئەرکی مرۆڤایەتی نەگرینە ئەستۆو ، پوختە هونەر بنووســـــین .. ئەگەر وابێ جا بۆچی بنووسین ؟!

**ئالین بۆسکی :**

زیان‌بەخش‌و پڕمەترسی‌یە هونەرو ئەخـــلاق تێکەڵ بکەین . لـــە بەرهەمەکـــانی ( دانتی ) و ( شکسپیر ) و ( دستەیەڤسکی ) و ( سڤینتا )وە ، ناتوانین هیچ دەرســـــێ هەڵبکوزێن . ئەدەب بـۆ قووڵترین گۆشـەی دڵ ئەگەڕێ هیوا یا نائومێدی، تەنیایی یا تێکەڵی خەڵك بوون ، خەو یا واقیع.. بۆ پێگەیاندن‌و پەروەردەی خــەڵــك ، دەوڵـــەت لەســـــەریەتی ، کتێبی پەروەردەیی بڵاوبکاتەوە .

هــەرچی بلیمەتیشـــە ئــەوە شـــــتێکی‌ترە .. ( مایکوفسکی ) شایەتی سەردەمەکەی خۆی بوو لە وڵاتەکـــــەیدا . زۆرجاریش لە بلیمەت ناگەن ، چونکە ئەو پێش ڕۆژگاری خۆی ئەکەوێ ، ئەمەوێ بێ‌پێچ‌وپەنا بڵێم کە جوانی ، کەمـــال ، خۆیـــان جوانترین‌و بەرزترین مانای ئەخلاقین .



**بەفتەشینکۆ :**

ڕێبازی دژەڕۆمان ( ئەنتی ڕۆمان ) لە کاتی خۆیدا چ ئاژاوەیەکی نایەوە ؟! ئەگەر لێتبپرسین ناوی دە ڕۆماننووسی هاوچەرخی جیهانمان بۆ بژمێری ، تۆ ناوی کێو کێ ئەڵێی ؟!

**ئالین بۆسکی :**

ڕۆمانی نوێ ـ یا دژە ڕۆمان ، مەرگی ڕۆمانی دەروونیو مەنتیقی لەگەڵ خۆیدا هێنایە کایەوە . مەبەستم لە بەرهەمەکانی (بەلزاك)و ( تەلستۆی)ە لەم تێڕوانینو بۆچوونەوە ، ڕەگەزی شیکردنەوەی دەروونیو گومانی ئەبەدی نێوان پاڵەوانو کردەوەی پاڵەوان هاتە ئاراوە .. باشە ، خراپە تا کوێ ؟! تاکوێ نووسەر پێی لێ هەڵئەبڕێو ئەبێتە ددمڕاستی بەرهەمەکەی ، ئەو خۆی تا کۆتایی ،

نازانێ چ هۆیەك ئەبێتە پاڵپێوەنەرو هاندەری هەڵسوکەوتی پاڵەوانەکەی . لە کۆتاییدا « ڕۆمانی نوێ » ، لەسەر زەمینەی سامو ترسی بەردەم جەنگی ئەتۆمی لەدایكبووە ، لەو جەنگەدا کە شست ، وەزع ، ڕەگەزەکانی دەوروپشتیش ئەوەندەی مرۆڤ دەور ئەبینن ، من ئەم بیرەم لەم پرسیارەدا خەست ئەکەمەوە : « مرۆڤ ئەتوانێ دەرگا بکاتەوە ، یا بە هەر هۆیەکی نهێنییەوە بێت ، دەرگاکە مرۆڤ ئەخاتە سەر کەلکەڵەو بیری وازکردنی ؟! » ...

من تەنیا ناوی ئەو ڕۆمان نووسانە هەڵئەدەم کە تائێستە لە ژیاندان .. لە پەخشاندا پێش هەمووکەسێ ( تێنسی ولیامز )ـ ئەمریکا ، ( یەشار کەمال ) ـ تورکیا ، دوای ئەمانە ( گابرێل گارگیس مارکیز ) و ( خورخی لویس بورخیس ) ـ ئەرجەنتین ، ( سەموئیل بیکیت ) وەك ڕۆمانو

شانۆ نووس ... سێ شاعیریش شڤێد ئارتۆر ـ لوند کڤیست ، ئیلسڤیتا بەگرانا ـ بولگاریا ، یانیس ، یسۆس ـ یونان لە تەوازعەوە ناوی فەرەنسایییەکان نالێم ، هەرچەندە ناتوانم ( سارتەر ) لەبیربکەم . ئەو نازەشم بدەرێ ، کە ناوی ئەو نووسەرە رووسانە نەهێنم ، خۆشمەوێن .

**یەفتەشینکۆ :**

ئێستە بە نووسینی چییەوە خەریکی ؟!

**ئالین بۆسکی :**

دوای دەرچوونی ژین نامە ڕۆمانەکەم « دایکێکی ڕووس » ، کە وەرگێڕدراوەتە سەر شەش زمان ، خەریکی تەواوکردنی ١٦٠ ساتیرە شیعرم ، کە تیایاندا ئەم پرسیارانە ئەکەم : مرۆڤی

تۆڵنەدەر کێیە ؟! ئەی چی ئارام بەخشە ؟! دەستەڵاتی پارە چییە ؟! شیعری فەرەنسی زۆر توخنی ئەم جۆرە باسانە نەکەوتووە .

**یەفتەشینکۆ :**

چۆن بۆ ئەدەبی ڕووسی ئەڕوانن ؟!

**ئالین بۆسکی :**

چەندێ شیعری ( پوشکین ) کەم کراوەتەوە فەرەنسی ، ئەوەندەش بالآی ئەفسانەیی «گۆگەل» نادیارە لامان . نە ئەمو نە ئەو لە ئەدەبی ئێمەدا بە چاکی دەرنەکەوتوون . بەلآم ئێمە ( دستەیڤسکی ) بە یەکێ لە هەرە کەڵە نووسەرەکانی جیهان ئەزانین . لەراستیدا دستەیڤسکی چەند هەنگاوێ لەپێش، (شکسپیر) و ( سێرڤانس ) و (گیتە)وەیە .

کارێکی گەورەی کردۆتە سەر نووسەران . دستەیڤسکی لەو نووسەرانەیە کە بە هەستو دەروونو ناوەوەی مرۆڤدا زۆر بە قووڵی شۆڕ بۆتەوەو شیکردۆتەوە .. ئەوەی دستەیڤسکیو

کافکا توانیویانە لەم ڕووەوە بیکەن ، کەسی تر نەیتوانیوە . لە سییەکانیشدا خەڵکێکی زۆر بوونە هەواخواو حەزلێکەری شیعری مایکوفسکی ،

بەتایبەتی لە سیمای ( ئاراگۆن )دا ئەویان ئەبینی .. لە شانۆگەری چلو پەنجاکانی ئێمەدا ، جێپەنجەو تەئسیری ( چێخەف ) دیارە .. ئێستەش لە مەیانی شیعرا ، شاعیرە لاوەکانمان

هەڵێکی شیعری تازەو تەڕی سۆفیەتین‌و بەتاسەوە بەدوایدا ئەگەڕێن ...

## دووا وشە

گەلێ دڵخۆشم بەم گفتوگۆیەم لەگەڵ ئەلین بۆسکی‌دا ، بەتایبەتی ئەو یەکێکە لە کەڵە شاعیرە ڕابەرەکانی فەرەنسا .. شاعیرێکە کـە خوێنەرو دۆستی شـــیعرەکانی زۆرن . زۆر دەمێك نی‌یە ئەکادیمیای فەرەنسی ڕۆمانی « دایکێکی ڕووس »ی لەچاپداوە . جگە لەمەش ئالین بۆسکی ، یەکێکە

لە ڕەخنەگرە بەناوبانگەکان‌و هەمیشە لە رۆژنامەی « لۆمۆند »دا ، دەربارەی ئەدەب‌و گیروگرفتەکانی شت بڵاو ئەکاتەوە . سەرباری ئەمانەش پسپۆرو شـــــارەزایەکی چاکی ڕەســـمەو پێشـــــانگا شەخسی‌یەکەشی بە یەکێك لـە پێشـانگا چاکەکانی پاریس ئەژمێردرێ . ئاســـــان نی‌یە مرۆڤێکی‌وا چالاك بەو هەموو بەهرە هونەری‌یەوە بدۆزرێتەوە

.. دایکێ بۆسکێ ڕووسەو خۆشی هەرچەند بـە فەرەنسی ئەنووسی ، بەلام ڕووســـــی‌یەکی چـاك ئەزانێ‌و بە بێ ئەکسێنت قســـەی پێ ئەکـات .

لەگەڵ ڕێزما بۆ وەڵامەکانی ئالین بوســـکی ، من دەربارەی هەندێکیان ڕام جیاوازەو ســـــەرنجی تایبـــەتی خۆمم هـــەیــە .. ئەمـــەش نموونـــەی سەربەستی بیرەو لە هونەریشـــدا بۆچوونی دوو کەس کوت‌ومت وەك یەك نابن .. لای من سەیرە ،

بۆچی شاعیرە لاوەکانی فەرەنسا،تاقی‌کردنەوەکانی خۆیان بەرەو ئاڵۆزی‌و تەم‌ومژی زیاتـر ئەبــەن ، بەرەو ئەوەی خەڵك لێیان تێ‌نەگا. ئەوەش جێی گومانە « کە فەرەنســا گوێ ناداتە دەوروپشـــــت‌و نایەوێ شیعر قیەمی تازەی بۆ بهێنێتە کایەوە »

من زەینم وا بۆی ئەچێ کە لاوە فەرەنسایی‌یەکان تینـووی زینـــدووکردنەوەی هـەنـدێ قیەمی بەرەواڵەت چەپڕەوانەو ناوەرۆك بورژوازیانەن .. لەگەڵ ئەمانەشدا رەخنەی بەجێ‌و مەوزوعی لـــە بورژوازیەت هەیەو ئەم ڕەخنەیە ، ڕەخنەیەکی ،

دوور لە ئەهلســـــتیەتە .. ڕەخنەیەکـــە لـــە چوارچێوەی خەبات‌و هیوا بووندایە بە پاشەڕۆژ.. هەروەها دەربارەی ئەوەش کە ئەڵێ : « نەك ڕەشە خوێندەوار ، بەڵکو چینی مـام ناوەندیش تاقەتی خۆماندووکردنی نی‌یە بە خوێندنەوەی شیعرەوە »

من ڕام جیاوازە لەم ڕووەوە ، لام‌وایە مەسەلەکە وانی‌یە. . دەربارەی ئەوەش کە ئەڵێ:« نە شۆڕشی ١٧٨٩ ، نـە کـۆمۆنـەی پـاریس ، لـە ئـەدەبی فەرەنســــــیدا ڕەنگیان نەداوەتەوە » .. هـــەر بەتەواوی ئەتوانین ئـەم ڕایـە ئاوەژوو بکەینـەوە بڵێین بە پێچەوانەوەیە ...

ئالین بۆسکی لای‌وایە ، ئەدەب‌و ئەخـــلاق نابێ تێکەڵاو بکرێن ، بێ‌گومان چاك نی‌یە ، ئەگەر ئەدەب بکەیتە مەیانی وەعزی وشك‌و برینگ ..

بەلام من لام‌وایە خوو نەریتی پیرۆزی مرۆڤایەتی لە هەموو ئەدەبێکی بەرزدا ئەدرەوشـــێتەوە .. ئەو خۆی وتی : مایکوفـــسکی بە شیعر خەباتی بۆ ســـەرکەوتنی شۆڕش ئەکرد ، شـــــیعری بۆ

سەرکەوتنەکانی ئەوت .. شۆڕش لای مایکوفسکی شتێکی مەیبوو و ساردو سڕ نەبوو ، بەپێچەوانەوە بورکانێکی هەمیشـــــــە ئاگرپرژێن‌و تازەبووەوە بوو .. جگە لەمانە چ سەرنجێکی ترم دەربارەی

بیرو ڕاکانی‌تری نووسەر نی‌یەو هیوادارم بتوانـم بەم گفتوگۆیەم یارمەتی خوێنەرانی « رۆژنامـــەی ئەدەبی » بدەم‌و لەو گیروگرفت‌و مەســـــەلانەی لە ئەدەبی رۆژئاوادا لەکایەدایە ، ئاگادارێکیـــــان بکەم .. دڵنیاشم نووســـــــەران‌و خوێنەرانی

نیشتمانی دایکی ( ئەلین بۆسکی ) ڕیزی ئەخەنـە سەر چاوان‌و بـــەو گەرم‌وگوڕیەشەوە کە پێوەی ناسراون ـ میوانداری ئەکەن .

* **ئەم گفتوگۆیە ، لە ژمـــارە ١٣ی رۆژی ٢٦ مارتی ١٩٨٠ دا لە « لیتیراتوورنەیا گازێتا ، رۆژنامەی ئەدەبی » دا بڵاوکراوەتەوە .**

ژیان و شیعری : سان ژۆن پێرس
ئامادەکردن و وەرگێڕانی : محەمودی زامدار

# ئاناباز



## نویشکێك

ماری رینێ یا ( ئەلکسی سان لیگێ ) لە ۳۱ مارتی ســــالی ۱۸۸۷ و لەیەکێ لە دوڕگــەکانی ئانتیلی ئەمەریکای نێوەڕاست ، کە (گوادلۆپ)ی

ناوە ، لە دایکێکی ســــەر بە خانەوادەیەك کــە کشتسازو زەریاوانی زۆر بوە ، لە باوکێکیش کــە خانەوادەکەی پارێزەرو پیاوانی یاســــــای

بەخۆیــەوە دیوە ، چــاوی خــەوالووی بـۆ ئەفسانەکانی ژیان هەڵێناوە ...

لەنێو دوڕگەو زەریاو سروشــــتی گــەرمی ئیســــــتیوادا ، ژیاوە . گەلێ لەلەی ژنە زنجی هەبوە ، کە بە نەژاد کۆنگۆیی‌و گینیایی‌و سەنیگالی بوون .. تێکەڵی گەلێ ئادەمیزادی هەمــەرەگەزو چەشنی وەکو : زنجی‌و چینی‌و ئانــامی‌و ژاپۆنی‌و ئەرمەنی‌و هیندی‌سوور بوە .. ئەم دەوروبەرەی منالیەی دەورێکی گەورەی لــە شیعرو لــەبــاری سەرنجی فراوانی مرۆڤانەی‌دا ، گێڕاوە .. !!

ساڵی ۱۸۹۸ و بۆ خوێندن چۆتە فەرەنسا ، لە پاشاو بۆ ماوەی ساڵێ ، چۆتە ریزی سوپاوە ، ئینجا چۆتە زانســــتگەی ( بۆردۆ )و بێ‌هەدادان‌و ئۆقرە ، لە موحازەرە جیاجیاکانی کۆلێجی یاساو زانست‌و ئەدەبیات‌دا ، ئامادەبوەو لەســــــەر شتێ سەقامگیر نەبوە .. لەپاشا حەزی بەگەشتی نێوزەریا کردوە ، دەمێکیش خەریکی باســــــی ئانترۆپۆلۆژیاو رووەك بوە ، ئینجــا روی‌کردۆتــە خوێندنی یاســــــاو باوەڕنامەی لیســــانسی لێ‌وەرگرتووەو جا بەرەو ئیســــپانیاو ئەڵمانیاو بەریتانیا کۆچ‌وباری تێکناوە ، تا لــــە پاریســــ نیشتەجێ بوەو تاقیمانەی لە دیپلۆماسیەت داوەو هەر لەساڵی ۱۹۱٦ - ۱۹۲۱ ، بۆتە ســــکرتێری



بالیۆزخانەی فەرەنسایی لەپەکین .. ئەم هەلەی بە هەل زانیوەو زۆربەی ولاتانی ئاسیای نیوەڕاستو چینو کۆریاو ژاپۆنو مەلایۆو ئەندۆنیسیا گەڕاوەو گەلێ گەشتی سەختو درێژو دژواری کردوەو گەورەترین چامەی شیعری خۆی ( ئاناباز ـ Anabase)ی لە گەشتی بیابانی جوبیدا نووسیوەتەوەو بەمەیش ئەزمونێکی فراوانی لە کارو بارو رازی رۆژهەلاتی دووردا ، دەسخستوە ... !!

لە سالآنی ١٩٢٥ ـ ١٩٣١ ، بوە بە ڕێبەری مەکتەبی دیپلۆماسی سەرووەزیرانی ئەوسای فەرەنسا ، لە پاشا بوە بەرێبەری سیاسیی ، لە وەزارەتی دەرەوەدا ..

لە سالی ١٩٣٣دا ، بوە بە بالیۆز .. !
لە سەردەمی نازیزمی ئەلەمانیاشدا ، بوە بە ئەمینداری گشتیی ، وەزارەتی دەرەوەی فەرەنساو جاڕی بەرەنگاربوونی دلێرانەی نازیزمی داوە ...

لە سالی ١٩٤٠ و دوای شکانی فەرەنسا ، روی کردۆتە ئینگلتەراو لەوێشەوە بۆ نیۆیۆرك .. لەودەمەدا جستابۆی نازی ،

خانوەکەی لەپاریس پشکنیوەو دەسنووسی حەوت بەرهەمی تەواوبووی ئەدەبیی سوتاندوە .. هەر لەو ساتانەشدا ، حکومەتی ڤیشی جنسیەی فەرەنسی لێ کێشاوەتەوە .. ئینجا رویکردۆتە واشنتەنو بۆ ماوەی پێنج سال ، بوە بە راوێژیاری کتێبخانەی کۆنگریس .. دوای

دامرکانی ئاگری جەنگ ، جنسیەو وەزیفەکەیان بۆ گەڕاندۆتەوە ، زۆر هەولیان داوە ، بگەڕێتەوە پاریسو نێو ریزی دیپلۆماسی ، کەچی ملینەداوەو

هەر لەوێدا ماوەتەوەو ئەو شارەیشی کردوە ، بەسەرشارێ بۆ گەشتەکانی خۆی لە کەنەداو ئەمەریکای نێوەڕاستا .. !!

* * *

ئەم کەلەشاعیرە ، دلو دیدە فراوانو ئەندێشە هەتەر بوە ، دەورێکی مەزنو دیاری ، لەبەشێکی باشی شیعری هاوچەرخو نوێی جیهانیدا دیوەو شوێنێکی بایەخداریشی لە مێژووی فیکرو شیعرا ، هەیەو بەردەوام ... سەرجەمی بەرهەمەکانی لەیەك بەرگو بەناوی « بەرهەمی شیعریی »و لە سالی ١٩٥٣ و لە ( ٤٧٨ ) لاپەڕەو بەم شێوەیە کۆکراوەتەوە :

١ ـ پیاهەلدان ـ کە برێتییە لە :
ا ـ چەند پۆرترێتێکی کریسۆی
ب ـ بۆ زەماوەندی ساوایەتی
ج ـ پیاهەلدان
د ـ دۆستایەتی میر
هـ ـ سترانی جێگری شا
و ـ لایلایە .
٢ ـ ئاناباز
٣ ـ باران •
٤ ـ خەلوەتخانە
٥ ـ با

لە سالی ١٩٥٩ دا ، خەلاتی بالای نیشتمانیی ، لە ئەدەبیاتو خەلاتی بالای نێودەولەتانی ، لە شیعرا وەرگرتوە .. سالی ١٩٦١ یش ، خەلاتی نۆبلی لە ئەدەبیات پێدراوە ... هەندێ جار ، بە ناوی راستەقینەی خۆیو

هەندێ جاریش بەناوی خوازراو ، ( سان ژۆن پێرس ) بەرهەمەکانی بلاوکردۆتەوە ..!!

* * *

ژۆن پێرسی شاعیر ، لە مەسەلەی کێش‌و قافیەی شیعرا ، زۆر سەرازادەو شیعر بە پەخشان‌و پەخشان بە شیعر تێکەڵ ئەکات ، بە شێوازێ ، ئەو شیعرو پەخشانە لەیەك شەمزێنراوە ، تەنیا لەرێی ئیقاعێکی پڕ لە جوولەو هارمۆنی نێو شەپۆلە شیعریەکانی ئەبێ ، نازانرێ ... بەلام سەرپەرترین خاسیەتی شیعرەکانی ( وێنە ) یەو بە چەشنێکی زۆر داهێنەرانە ( وێنە )ی وا ، دائەهێنێ ، کە وەك دوکتۆر عبدالرحمن بەدەوی واتەنی :

« ئەبێتە مایەی هەلبژاردنی ، بۆ ریزی هەرە پێشەوەی شیعری هاوچەرخی جیهانی .. » .. !!

کە شوهەوای شیعرەکانی ، زۆر مرۆڤانەیەو ساتوسەوا لەگەڵ هەموو جۆرە دەوروبەرێ ئەکات ، هەر لە زاینگەکەیەوە بگرە ، تا ئەگەیتە دەوروبەرە پیشەسازیە هەرەپێشکەوتوەکان‌و تا گیانی خۆرسکانەی زنجیەکان‌و بۆن‌وبەرامەی رۆژهەلات‌و دوکەلی فابریقەی شارە دڕاوو لەندەهۆرەکان ، ئەمیش هەمووی بە هەستێکی یەجگار وردەکارانەی لە درێژەپێدان‌و سۆزو ئەندووی خولقێنەرو داتاشینی دەستەوازەو دەسچنکردنی ووشەی لەبارو ژانگرتوو ..!!

هەندێ لە رەخنەگرانی سەلیقەدار ، سان ژۆن پێرس،بە شاعیری گەردون‌و دیاردە دینامیکیەکانی دائەنێن‌و لەو باوەڕەشدان ، کە فەرهەنگی ئەم کەلەشاعیرە ، لەو رەگەزو دیاردە گەردونیانەوە پێكهاتوەو بەندە ، بە وەسفکردنی جوولانەوەو گۆڕران‌و شەلەژان ، خولقانی پەی‌دەرپەی‌و لەهەمان کاتیشا ، لەتەك شەمەندەفەری مرۆڤی ئەم چەرخەش رێ‌ئەکات ... !!

* * *

مەبەستی من ، لێرەدا ، لە بلاوکردنەوەی ئەم کورتە ژیاننامەو ئەم دووپارچە درێژەی ئەم شاعیرە ، جیهانی‌و گەردونی‌یە ـ گەر پێ‌ی وێرابم !! ـ تەنیا دەرگاو دەروازە والاکردنە ، لەبەردەم نموونەو دەقەشیعرو رێبازە شیعریەکانی جیهانی‌دا ... تا زیاترو بە چێژتر ، نەوەی نوێ ، ئاگادار بکرێت‌و سوودی لێ‌وەرگرێت‌و قوولتر ، زۆر قوولتر ، سەیری ژیان‌و شیعرو جوانی‌و دەوروبەر بکات‌و چێژو هۆش‌و بەهرەی تۆقلە دەرکردوی خۆی ، بە هاوچەرخێتی‌و بەرەسەنایەتی‌یەوە ، پێ زاخاو بدات ... !!

* * *

## ئانابان

### — ١ —

بە سەربەرزی‌یەوە ،
خۆم لەسەر سێ کژا ، هەلئەخەم
نوقلانە بۆ ئەو زەوی‌یە لێئەدەم ،
کە خۆم یاساکانیم داناوە
چەك لە سەرلەبەیانی‌و لەزەریادایە .
ئەسپەکانمان بەبێ بادەم
بەخشیە ئەو زەوی‌یەی ، کە ئەو ئاسمانەی
بۆگەن نابێت ،

بۆ ئامادە ئەکات .
خۆریش بێ‌ناوە ، بەلام هێزەکەی لە نێوانماندایە .
زەریاش لەبەرەبەیاندا
لەزات‌و جورئەتی گیان ئەکات .
ئەی توانا ،

تۆ وا رامبووی لە سەرەرێی شەوانماندا
گۆرانی بچڕی !
لە جەژنە پاکەکانی بەرەبەیاندا ،
ئێمە چی لە خەون ، ئەزانین ،
چی لە مافی لە دایك بوونمان ئەزانین ؟
بۆ پتر لە سالێکیش !

ئاغای گەنم‌و ئاغای خوێ‌و کاروباری دەولەتیش ،
لە یەك ترازوی یەکسان دایە !
کەسی ئەوبەر کەنارەکە ، بانگ ناکەم .
نیگاری ناوچە مەزنەکانی ،
شارانی پالّ شێوەکانی ، وەك پۆدرەی مووروو
مەرجان

ناکێشـــم .
بەڵام بە هیوای ، ئەوەم لە نێوانتا بژیم .
مەزنی ، هەر لەئاسمانەوە، تا بەردەم رەشماڵەکانە
هێزی من ، لە نێوەراستی تۆدایە !
بیریش ، وەکو خۆی پاکەو
پاسای ترازووەکانی خۆی لەرۆژا ، رائەگرێ .
ئێستا توانیومە ،

بوروژێمە نێو شاری خەونەکانتو
لە بازارە چۆڵو کلاکاندا ،
بڕیاری بازرگانیی ، ئەم گیانە پاکەی خۆم بدەم .
لە نێودڕاستی تۆدا ئەبینرێو
لــە ئاگرەپووشی تیژڕەوی نێو پەنجەرەیەکی واز ،
تیژڕەوترە .

هەموو قومی کانی گیان ،
سەر بە شادمانی ئەو خوێیەیە .
هەر بەخوێو بەخێرایی ، دەمــە ساردوسڕەکانی
ئارەزوو پڕ ئەکەم .

ئەو ئاوی خۆڵو قومەکانی نێو خەڵخوەتخانەکەی
نەخواردوەو
بە باڵای تینوێتی هەڵئەلێ ،
فــەرزێکی چکۆلانەم ، لــــە بازرگانی گیـــاندا ،
پێبەخشی .. ،
« خۆر بێ ئاوە ، بەڵام هێزەکەی لە نێوانماندایە »
پیاوەکان ،

ئەی پیاوانی خۆڵو رێگاکان ،
ئەی پیاوانی کارو رابواردن ،
ئەی پیاوانی سنوورو شوێنەکان ،
ئەی ئەو پیاوانەی ، کە لە بیرەوەری ئەم وڵاتەدا ،
لاسەنگ بوون ،
ئەی پیاوانی شـــــــێو دۆڵو تەپۆلکە بەرزەکانی
جیهانو

رێژگەی کەناری روبارەکان .
ئێوە ئەی ئەوانەی ، لە رۆژاوادا ،
رازی هەناسەکانی ( با ) ئەدرکێنن ،
ئێوە ئەی شوێن پێکەوتوانی ، وەرزەکان ،
رەشماڵەکانتان ، لە گەردوگولی بەیانی ( با ) یە
هێمنەکاندا لێئەدەن ،

داخ ! ئەی پشکنەرەکان ،
ئەی ئەوانەی وەرزی کۆچکردن ،
لە هەمو شوێنێکا ، ئەدۆزنەوە .
ئێوە بە خوێیەکی بەهێز ، لە بوار ئەدەن
کاتێ کە دەهۆڵەکانی ئاوارەیی ،
لە گەوشەنی ئەو هەمیشەییەی ، کە لە سەر
قومو چەوەکان ، باوێشک ئەدات ، رائەپەڕن ،
لە بەیانا ، لەساوستێبەری ،
هەرێمو ئاوە مردووەکانی هەڵواسراوی
نێو چڕەدوکەڵی جیهان ، رائەپەڕن .

* * *

لە جلێکی پاکو لەنێوانتا ،
پتر لە ساڵێکە لە نێوانتام ،
ئاوبانگم لە زەریاو هێزم لە نێوەراستتایە .
هەمان بای ئەودیو کەنارەکان ،





ئاوێزانی چارەنووسمانەو تۆوی پاشەڕۆژی .
لە تەك خۆی هێناوە .
چاخەکە . لە کەناریا . لە تریفەی ترازووەکانیـــا
بریسکایەوە .
ماتماتیکە کلۆمکراوەکانی .
سەر تۆپەڵە بەستەڵەکی خوێی ســــەر ئـاو
کەوتوو !
لەسەر ئەو شوێنە ناسکەی تێولم .
کە قەسیدەکەم دانایە سەر .
من نوتەی سترانی هەمو خەڵك دائەنێم .
ئەو سترانە مەزنەی .
کە هەمو پاپۆرە ئەمرەکان . رائەکێشێنەوە
نێو ئەستێرکی پاپۆرەکانمان .

— ٢ —

بێدەنگی یە سامناکەکەی . نێو وڵاتە ورووژاوەکان
ورووژاو بەیاریکەرانی کریکێتی دوای نیوەڕو .
من ئەڕۆم و تۆش .
بەرەو وڵاتی شێوە درێژەکانی . پڕ لـــە دارلیمۆ
ئەڕۆی .
کـــە جلوبەرگی پیاوە مەزنەکان . دەرئەچن . بۆ
وشك کردنیان .
کراسی شاژن لە تەناف ئەدەین .
کـــە هەموی بەشــــرێتێکی دوویـاخـــەداری
ڕەنگ سمۆرەیین .

« تەحا ! لە توانای لەشی بەترشۆکی ئەو ژنەی .
کە کراسی بن هەنگڵی لەککەدار . ئەکات .. »
کراسی پرشـــــنگدارو دوویاخـــەداری کچەکەی
هەڵئەخەین .

« تەحا ! لە زمـانی مارمیلکە . کاتێ کـــە ڕاوی
زیندەوەرانی بن هەنگڵ ئەنێ »
دوور نیە . ئەم ڕۆژە بە بێکەسی ئەڕوات و
ئارەزوی ئەم پیـــاوەش . بۆ دیداری ئەو ژنــەو
کچەکەی ئەسوتێت .

باخەنینەی پاکی مردووەکان
ئەم میوەیەمان . بۆ پاك کاتەوە ! ...
چیە ! ئایا هیچ جۆرە خۆشیەکی تر .
لەم جیهانەدا نەماوە .
تەنیا لە ژێر ئەو گوڵەکەوەدەنەدا . نەبێ ؟
لەملای جیهانەوە . نەخۆشیەکی ئەرخەوانی .
لەسەر ئاوەکان دائەکشێ .
بایەکان هەڵئەستن .
بای مەزنی زەریا .
جلوبەرگەکان ئەلەرزێنەوە ! هەروەکو :
قەشەیەك لەشی خۆی . ونجڕونجڕ کات .

— ٣ —

لە دروێنە رووتەکەدا . پیاوەکە هەنگاو ئەنێ .
من نازانم چ هێزێك . لەسەر بانەکەم قسەی کرد .
لام وایە . ئەو شاهانە لەبەر دەرگاکەم ڕاگیران .
پالیۆزەکانیش لەسەر خوانی شـــاهەکان . نـان
ئەخۆن .

« وازبێنە . با لەگەڵمی من بخۆن ! »
پشکێنەری میزانو ترازووەکان . شۆڕ ئەبێتە نێو
ڕوبارە ئاوسەکان .
هەمو جۆرە پاشەڕۆکێکی زیندەوەرو هەژگ وهەلا.
بەردێنیەوە . ئەگیرسێن .
وەرە !

ئێمە . سەرسامی تۆین . ئەی خۆرەکە !
ئەم جۆرە درۆیانەت بۆ درکاندین . .
تۆ . ئەی وروژێنەری کۆسپو ناکۆکیەکان !

ئەی تێربووی . جوێنو ریسواکردن .
ئەی قۆچەقانی‌یە . سەرچڵەکە !
بادامی چاوەکانم بتەقێنە .
دڵم بۆ زامەکانی ژێر دارلیمۆ لەوەندەکە . بخە سەرگۆرانی .

باڵندەکە ئەچریکێنێ :
ئەی کۆنەچاخەکە ! . . »
روبارەکان . لەرێرەویانا ، وەکو هاوارو ناڵەی ژنان وایە ،
ئەم جیهانەش . لە پێستی دابەستیەکی سوور گەلێ جوانترە !

ئا ! چیرۆکی گەڵای سەردیوارەکانمان زۆر فراوانە ،
ئاویش . لەناوی نێو خەونەکان . بێگەردترە .
سوپاس .

سوپاسی ئەکا .
چونکە خەون نەبوو !
گیانم پڕە . لەفێڵو فەرەج .
وەك ئەو زەریا سرکو بەهێزەی . ژێر
بانگەوازی روونبێژی‌یە . وایە . !
چرەبۆنەکە .

ئالۆقەی داوم .
گومانیش بەرزئەبێتەوە . وەکو :
بەرزبوونی . بۆ راستیی شتەکان .
بەڵام گەر پیاو . چمکی شێتایەتی خۆی گرت . با کامەران بێت .

وازبێنە . با بیهێنێتە بەردەم رۆشنایی رۆژەوە !
لام وایە ئەکوژرێ .
ئەگینا هیچ جۆرە سەرکێشیەك . بەرپا نابێ .
ووتی واباشە :
ئێمە ئەی راوێژیاری قازانجە بێ‌پایانەکانمان. ئێمە گەرمت ئەکەینەوە .

زەریا تورەکانی . نێو دەربەندەکان . فەرمانی تەسك نازانن !
پیاویش بەمەی سیامەست ئەبێت .
کە دڵەکەودەنەکەی خۆی . وەکو کێکێك مێشێکی رەش لێی دابێ ،
لێشەدا .
ئەمجۆرە فسانەش دەپەیڤی . .
گوڵاڵە . شادمانیەکی ئەرخەوانی :
ئەم زەوی‌یە . وەك من ئەڵهای ئەکەم . فراوانە .
ئێ کەواتە . کێ هەیە لەم سەرلەئێوارەیەدا ،
سنوورەکان دیاری بکات ؟
فشارێك لە نێو دڵی داناکە . دایە .
کێ ئەتوانێ . لەم سەرلەئێوارەیەدا .
سنوورەکان دیاری بکات ؟
ئەم چەشنە پیاوە .
گوڕی ئەم چەشنە پیاوە .
پیاوێکی نەدارە .





بەهێزی نوقڵانەوە دێو خەونەبینێ .
نیشانەیەك لەسەر ئەو ڕێگایانە ، دانێ ،
کە خەڵکی هەمەرەچەڵەکی بەسەرا ئەڕۆن ،
ئەو ڕەنگە زەردە ، لە پاشەڵیان پیشان ئەدەن :
میرەکان ، وەرزێرەکان ، زەرباوانە دەمهارەکان :
ئەوانەی کە شتی زۆر گەورەیان کردوەو
ئەوانیش کە ئەمونەو لەخەونیاندا ، ئەبینن ...
کاهینەکە هەمو یاساکانی خۆی ، خانەخانە
کردوە ،
لەدژی چێژوەرگرتنی ژنان ، لەپەتیارەکان .
ڕێزمانناسەکە، شوێنێکی کراوەی بۆ پیلەکانی خۆی
تەرخان ئەکات .
بەرگدروەکە ، جلێکی لە قەدیفەکراوی جوان ،
هەڵئەواسێتە ، قەدی کۆنەدارێك ، ..
نەخۆشی سوسەنەکی ، هێرش بۆ پیاو ئەهێنێ ،
پیاوەکە ، جلە کەتانەکەی خۆی ،
بە ئاوێکی روون ئەشواتەوە .
کورسی نەخۆشەکە ئەسوتێنرێ ،
بۆنەکەی پێئەگاتو دڵی پێئەگەشێتەوە .
لە دروێنە رووتەکەدا ، پیاوەکە هەنگاو ئەنێ .
چرەبۆنەکان ، ئابلۆقەیان داوم ،
ئاویش گەلێ لەئاوی - گابال - روونترە ،
ژاوەژاوی دەمەوعەسرانێکی تر ، ئەخولقێنێ ...
بەدرێژایی ڕۆژانی ساڵێکی رووتەڵە ،
خاکی ژێر رووەکە سەوزەکان تێر ئەبێت .
نازانم هێزی کێیە ، چۆتە نێو هەنگاوەکانم ،
چۆتە نێو گیانی مردووەکانی ،

ژێر قوموزیخو میزو خوێو خاکەوە .
سەیرکە ..! وا دروست کراوە ، هەروەکو :
قلەگەنمێ ، بە گاڵتەوە بدرێ بەباڵندەکان ،
گیانیشم لەتەك چرپسکەیەکی مەزنی ،
بەردەم دەرگاکانی مەرگ ،
چاودێری گیانم ئەکات ...
بەڵام بە میرەکە بڵێ :
با بێدەنگ بێت :
لە کۆتایی ئەو ڕمەی ، کە لەنێوەڕاستی
کەللەسەری ئەسپێك دایە .

— ٤ —

بەردوام لەســــــەر ئەم خاکە زەردانەدا نیشتەنی نابین ، ڕۆیشتین .. هاوین گەلێ لــەو قەراڵیچەیە فراوانترە ، کــە چین دوای چینی ، کەش دائەنێتە سەر خوانی ئاســمان . زەویــە زلەکە ، لەسـەرروی خۆی پاشەڕۆکی ئەو ئاگــرە ڕەنگ بەرپوەی ژێر خۆڵەمێشــە ، تلۆر ئەکات . ڕەنگی گۆگرد ، ڕەنگی هەنگوێن ، ڕەنگی شــتە نەمرەکان ، هەموو زەوی لەتەك ئەو گژو گیایــە دایە ، کە لە نێو پووشوپەڵاشی زستانێکی ترەوە

لە چرپســـــکە ئەدەن . ئاسمانیش شــــبلە بنەوشـەییەکەی خۆی ، لەرپشاڵە ســـەوزەکانی تاقەدارێ ، ئەکێشێتەوە . شوێنی بەردەکــــانی میکا ! هیچ جۆرە تۆوێك لــــە درێنی بادا نیە .

ڕۆشـــنایش وەکـو ڕۆن وایە . خۆم بۆ ڕۆخی لـوتکەکــان ، بـە درزی بـرژانـگەکـانمەوە ، ئەبەستمەوە . بەردە خاڵدارەکانی گوێچکەکــان ئەناســـم ، بێدەنگی لە شــانەی روناکیەکاندا ، پـەنگاون ، لـەبـــەر خێزانی زەبروزەنگ ، لـــە دڵەراوکی دام .. وەکو حوشترەمێی بەســـتە زمانی بەردەم قەیچی ، کـــە بەکانە خورمــا ،

دووراوە ، وازبێنە بـا گردۆلکەکان لـەژێـــــر ڕوداوەکانی ئاسمانە بەداوودەرمانەکە ، هــەنگاو بنێن .. وازبێنـە ، بـا بێدەنگی لەســــــەر هەڵگیرسانێکی ڕەنگ پەرپوا ، بۆ پێدەشـــتەکان بڕۆن . لەئەنجاما کرنۆش بۆ دوکەڵی خەونەکــان ئەبەم .. لەو ساتەی کە خەڵکەکە لەنێو قوموزیخە

مردوەکەی زەویدا ، بزر ئەبن . لەوێدا گــەلێ
هێلی هێمنو مەزن هەیە ، کە رابەری شێتایەتی ،
لە رەزە مێوە ئێــستەرەمەکانی نێو یەك تاقەشوێنێ،
کە زەوی بنەوشــــەی گێژەلووکە دەرئەدات ،
ئەکات .

دوکەلی هەورەکانی قوموزیخ ، لەشـــوێنی
روبارە مردوەکان بەرزەبێتەوە ، وەکو : سنووری
جاخەکانی کوڕەوێك ..
بە دەنگێکی نزم ، بۆ مردوەکان ،
بە دەنگێکی نزم بۆ خۆر .
ئایا ئەمەندە شیرین نیە ، تا لە نێو دلی پیاوێکا
نەتوانێ ، بگاتە پێوەرێك .. ؟
من لەگەل تۆ ئەدوێم ، ئەی گیانی خۆم :

ئەم گیانەی من ،
بۆنی ئەســـپەکانو بەهەنــدێ بالندەی زەویە
میهردارەکە ،
ســـایەدارە .
لــەوپــەڕی رۆژهـــەلاتــە رەنــگ پەڕیوەکـــە ،
ئاسمانێکە ، وەکو :
شـــــوێنێکی پیرۆزی تێکەل بە سۆمای چاوی
کوێرێك ،
هەندێ هەوری رێكو هێمن لەوێدایە ،
کـــە شــــێرپەنجەی کافوورو دەزگای کەرەنای
تێدایــە ..

هەوری دوکەلەکان ،
بەرەو ئێمەو وبە هەمان ( با ) وە ، لارئەبنەوە .
هەموو چاوەچاوێکی زەوی ،
لــەو توێژالە دایە ، کە شتی ســـەمەرە لەســـەر
زەویا ،

ئەرسکێنێ .
لە نیوەڕۆشدا ، کاتێ کە درەختی ژیۆژۆپ ،
بنکەی گۆڕەکان لێئەدا ،
تا ببێ بە دوو درز ، پیاوێك برژانگەکانی خۆی
لێك ئەنێو کەللەسەرەکەی ،
لە نێو چاخەکانا ، سارد ئەبێتەوە ..
سوارانی خەون ، لە شوێنی خۆلە مردوەکە ، دان
ئـەی ئـەو رێگا چۆلانـــەی ، کـــە هەمان بـا ،
ئەتوروژێنێ ،

بەرەو ئێمە بەرەوە !
لەکوێ ؟ لەکوێ ئەو جەنگاوەرانە ئەدۆزینەوە ،
تا رابەرایەتی ، لەشاپلۆغانی روبارەکان بکەن ؟
بۆ ژاوەژاوێ ، ئاوێکی مەزن ،
لەسەر زەویا ، ئەخشێ .
هەمو خوێی زەوی ، لـــە نێـو خـەونەکانـا ،
ئەتەقنەوە .

لەپڕێکا ، ئاخ ! لەپڕێکا ئەو دەنگانە
چیان لەئێمە گەرەکە ؟
چەند پیاوێ ، ئاوێنەکان ، لەسەر گۆرەکانی
رۆخ روبارەکان ، هەلئەگرن ،
وازبێنە ، با بانگەوازی بۆ بەردەوامبوونی چاخەکان
بکات .

با رابەرایەتی ئەم شوێنانەش ،
لە سوارە برونزیە رەنگ سەوزەکانی ، سەررێگا
والاکان ، بن .
« سێبەری بالندەیەکی گەورە ، بەســـــــەر
دەموچاوما تێئەپەڕێ »

— ٥ —

چەند یاسایەك ، لەمەزاتکردنی ئەسپەکانا
چەند یاسایەکی گومڕا .
خودی ئێمەش « رەنگی پیاوەکان »
هەڤالەکانمان ، ئەوانەی لەنێو گێژەنەکە ، گەشت
ئەکەن ..
چـــەنـد کـــاژمێرێکی ئـــاوی ، لـــەکۆڕەوەکـــەی
سەرزەویدا ،

دارژانی بارانی سامناکی چەندین ماددەی سەیر ،
گەردەلوولێکی خۆلو زیندەوەر ،
کە پیاوەکانمانی ، لەبیابانا وەکو ســـەری باجێك
راونا .
« بۆشاییەکی زۆر ، خۆی ئاخنیە نێو دلمانەوە ! »

★

نەك لەبەر ئەوەی کۆڕەوەکە قات بوو :
بەرەو مەنزلگە کەودەنەکانو بێزین ، کەوتبوە رێ
« ئەسپە پاکەکانمان ، بە پیرە چاوەکانیانەوە »

گەلێ شت ، لەبەر سێبەری گیانەکان دەستی
پێکراوە ،
گەلێ شت ، لەسەر سنووری گیانەکان ،
داسەکناون

گرمەیەکی بەهارێژن ، لەتەك زایەلەی
سلندەرەکانو زەوی خۆی بۆ تەختکردنی
حیسابەکە ، بەدەستەوە ئەدات ..
شتێکیتر : ئەم سێبەرانە ـ فڕوفێلی ئاسمانە لە
دژی زەوی ..
چەند سوارێ ، وەکو ئەم کۆمەڵە خەڵکانە ،
تێپەڕین ..

هەندێ جار ، رقوکینە ، وەکو : باڵندەیەکی
بچووك ،
کەوتە چریکە .
ئایا قامچی ، لەڕوی ئەو وشە خەساوانەی
بەختیاریدا ،
هەڵگرین ؟
هۆ پیاوەکە ، قورسایی خۆت ، بە گەنمەکە
بکێشە .

خاکێ لێرەبێ ، هی من نیە .
ئەم جیهانە ، غەیرەز ، لەجوڵەجوڵی گزوگیا ،
چیم پێئەبەخشێ .
لای راستەی ئەو شوێنەی ، کە بەدارەرووتەڵە ،
ناوزەد کراوە .

روناکییە برسیەکەش ،
ئەم ناوچانەی رۆژئاوام ، بەسەر دابەش ئەکەن .
بەڵام لەدواوە ، لەولاتی شیناوەردە فراوانەکان ،
حەسانەوەیەکی مەزنی ، بێیادگار ، هەیە .
ئەمساڵە ، بێقەرەوێتو بێیادگاری ساڵانە ،
بەبەرەبەیانو ئاگر ، فێنك کراوەتەوە .
« قوربانیی دڵی مەڕێکی رەش لەبەرەبەیانا »

★

ئەی رێرەوەکانی جیهان ،
مرۆڤ بەدواتەوەیە .
دەسەڵاتێك ، لەسەرووی هەموو مزگێنیەکانی
زەوی دایە .
ئەی گەشتوەرەکەی ، نێو ( با ) یە زەردەکە ،
ئەی چێژی گیان ! ..
تۆ لەسەرروەتو سامانی هیندستان ئەدوێیت ،
بەڵام ئەو تۆوەی وردی ئەکەیت ،
ئەبێ بە ژەهری ئەو سەروەتوسامانە

★

ووتی : تیوری زەبروزەنگی کوشندە ، رەوشتمانە

★

## گۆرانیەك

ئەسبەکەم ، لەژێر درەختێکی پڕ لە باڵندەی
قومریدا ،
راوەستا .
حیلەیەکی بێگەردی کرد ، بە شێوەیێ لەوێدا
هیچ جۆرە پەیمانێك ، بۆ کەنارەکانی نادرێ ،
ئەو کەنارانەی ، کە هەمو روبارەکان ئەزبەریان
کردوە .
« گەلا جێهێشتن لەبەیانا ، بەڵگەی ناووناتورەیە »
وانیە ، ئەو پیاوەش ، خەمگینەکە بێ .
بەڵام لە خەو راپەڕاندنی بەر لە رۆژهەڵاتنو
خۆپاراستنی بەترسو لەرزی ، لە بازرگانی
کۆنەدرەختێ ،

ئانیشکی بە بن چەناگەی خۆی ،
لەسەر دوائەستێرەکە ، داوە ،
شتەکانی ، لە نێو ناخی ئاسمانی تیژڕەوا ،
بەسافیو بەفراوانی بەدی ئەکات .
ئەو شتانەی کە لەشادمانیا ، ئەتەقنەوە .

★

ئەسپەکەم ، لەژێر درەختێکا وەستاوە .
گمەی کۆترێ دێ .
فیکەیەکی پاك ئەکێشم ..
سڵاو لەوانەی ، کە لەسەرەمەرگ دان ،
ئەوانەی ، کە رۆشنایی رۆژ ، نابینن .
بەڵام خەبەرێك لە برا شاعیرەکەمەوە هەیە ،
خەریکی نووسینی شتیترو شیرینترە ،
هەندێ کەس هەن ،
ئەو شتانە ئەزانن .

## بـا

« مەست ، سیامەست ، جاران ئەتووت ،
ناتوانی مەستی ئینکار بکەیت »
پیاوێکی تر ، لەنێو بادا رائەپەڕێ .
گۆرتەوشەیەك ، وەکو : تەقینەوەی
ئێستقانۆکەیەك .
بێ لەگۆشەی رۆیشتنا ، ئامادەیە ..
« ئاخ ! بەڵێ ، هەمو شتێ دڕاوە ! با ئەمەیان
هەمو دنیا بیزانێ ! »

به تایبەتی لەنێو زیندەوەرەکانی خـــوارەوەدا . .
ئەم مەسەلەیە زۆر گرینگە .

ئەی ئێوە ئەی پیاوەتازەکان چی‌ئەکەن ؟
حەند نینۆکێکی قورس‌و تێکەڵ بە تێولی کاژمێرە
بەرەڵلاکە .
ئەوانەی لە ژورەکـــانا خەونیان ئەبینی ، دوێنێ
ئێوارە
لەسوچەکەی تری روبەڕوی مانگە دژەکان نوستن.
هەنــدێکی تر ، عەرەقێکی تازەیان لەکـــانیـــاوە
بۆیەکراوەکان بەزەنجەفەر خواردەوە .
ئێمەش لەئەوانین ، هەروەکو چۆن لەجەژنەکانی
بـــادا ،
ئەو خەمەقووڵەی ، کە لەناخماندا سەرهەڵئەدا ،
بۆ بادەی عەرەقی پیاوەتازەکان ئەڕوات .
ئەو خەونەی ، کـــە خەونــدیــدەی چـــاوەنۆڕ ،
سەرسام ئەکات ، نەما .
رزگاری‌ی ئێمە لەخێرایی‌و لەهەڵوەشاندنایە .
بێ‌ئارامی ، لەهەمو شوێنێ دایە .
لەسەرشانی خەوندیدەکەوە ، گوناهی :
خەون‌و وەستان دیارە .
با حەشامەتی پیاوە دەســــەڵاتدارەکان بەدوامان
بگەڕێن ،
با لەسەر سنوورەکان لێمان بگەڕێن .
ئەو پیاوانەی کە بێکاری کردونی ، بە جادوگەر ،

پیاوە نکاوەکان ، ئەو پیاوانەی کە :
بەرەچەڵەك لەیەزدان کەوتونەتەوە .
ئەو پیاوانەی عەرەقی تازە ئەخۆنەوە ، وەك بڵێی:
بروسکە ، دووبەدەریانی کردبێ .
ئەبێ بەشێوەیەکی چاکتر ، روبەڕوی :
هێزو چاوی بەستراویان ، ببینەوە .
« رزگاری‌ی ئێمە لە چنگیان ، بەدانایی‌و پەتەڕیانە
ئەبێت »
ئەو خەمە قووڵەی کە لەناخماندا پەیا ئەبێ ،
سەرلەنوێ بۆ بادەی ئەو پیاوانە ، ئەڕواتەوە .
رووبەکی تـر ، بەرزئەکـەینـەوە ! بەڵێنــــدەرو
شـایەدەکان ،
بەڵێنی ئاغایەتی جۆنی‌و دنگەکان ئەدەن .
خۆ گەر پیاوێ لەنێو ئێمە هەڵساو روی مرۆڤانەی
خۆی گۆڕی ،
با بەهێز بیگرین‌و بیخەینە دەم ( با ) وە .
ئـەو خواوەندەی ، کـە لەنێو بادا ، ئەگـەڕێن ،
بەخۆڕایی
قامچی بەرز ناکەنەوە .

پێ‌ی ئەوتین ـ ئایا پێتان بڵێم ـ :
سەد دەمەشمشێر ، بەساتێ تیژ ئەکرێن .
بێگومـــان دەمی روداوو کارەساتیشمان بۆ تیـژ
ئەکەن .
لەسەر هەڵدانیا وەك :
تەقینەوەی بەردەســـماتە ، یا گاشـــەبەردی دەم
تیرێ وایە .
« ئەی ئەو خواوەندانەی . کە لەنێو شـــکۆفەی
خەونەکانەوە دێن .
من پرسیار ناکەم ،
بەڵام ورووژانی کارەسات‌و جلە دامەن کورتەکانن ،
ئێمە باشــــتر وپەتەڕیانەو بەتوڕەیی کارەکانمان
پێش‌ئەخەین باری مردوان ، بەهیچ کلۆجێ
لەخەمەکانی ئێمە نیە ،
هەروا باری قەڵاش‌بوەکان .
زەبـــروزەنگ بڕوامـــانـــە ، یـەکێتی خـوێـن
بەختەوەریمانە .
ئەو کتێبە زلانەی ، کە : راوبیرەکانی ( با ) یـان
هەڵگرتوە ،
لەکوێ ئەیدۆزیتەوە ؟
کەواتە ! ئەیکەین بەلەوەڕگایەك بۆ خۆمان .
یاسای ئێمە ، رق ئەســــتوری‌یەو دووبەرەکیش
خوومانە .
ئەی خواوەندەکان ،
ئێمە بەغەیری دووبەرەکی هیچ لەنێوانمانا نیە »
داخوازیەکانمان ، لەسنووری مرۆڤانەی خـۆی ،
لەڕادەبەدەر بوو .
ئەی قەڵاش‌بوەکان ، فیکە بکێشن ، بایـەکە زۆر
بەهێزە !
ئەمەیان تاقە دەسەڵاتێکی ئێمەیە
لەتەك ئەم هاوارە مەزنەی ، کە مرۆڤێ لەنێو بادا
ئەیکا ، رائەچەنین ،
بەرەوپێشـەوە ئەڕۆین . چەند پیاوێکی زیندووین،
داوای : پێشـەکی کەلەپورمان ئەکەین .
دەئێوەش لەهەمو شوێنێ ، لەتەك ئێمە راپەڕن ،
با مافی تەواوی خۆمان ، بەتەواوی ببەخشین ،
ئەی زیندوەکان .

★ ★ ★

ئا ! بەڵێ ، هەمو شتێ دڕاوە ! ئـا ! بەڵێ ،
هەمو شتێ ونجڕونجڕ کراوە ،
ئەو ساڵەش ، کە تێئەپەڕێ ، وا باڵەفرکەیەتی !
فرینی پیرەوکردن‌و تووکەکەش نەرمە !
نڤیشــــکێك‌و دارەخورمـایـەك ، لـەبـەرزبونی
نیشانەکانا هەیە !

شانی شارە لاربوەکەی بۆ دەریا ،
لە نیگەرانی کاغەزە سپیەکانا :
چەند نەورەس‌و بلاوکراوەیەکەو بەیەکەوە ئەفڕن.
بێ‌ئارامی ، هەمو لایەکی تەنیوەتەوە .

پیاوە نامۆکەش ، لە هەمو لایەکـــەوە ، بۆ گشت ئەو شتانە سەربەرزئەکاتەوە :
پیاوەکە بەگاسنێکی سەرخاکێکی رەش‌راهاتوو ،
ســـوارەکەش لەولاتێکی بەرزی ســـنوورەکانی ئاسمانێکی نزم دایە ،

پیاوە زەریاییەکەش ، لەنزیك دەربەندەکانەو خەریکی :

تەقاندنی لوتکەی پەردەی پاپۆڕەکەیە .

فەیلەسوفە بابۆفیەکەش ، بەســـەرکوتی دەرئەچێت‌و لەبەردەم دەرگاکەی خۆی ئەوەستێت ئەبینێ :

سێ‌جار ، شارەکە ، بەنیشانەی بروســـکە خاپوورکراوە ،

سێ‌جارە ، شارەکە ، لـەژێـر گرمـــەی هەورەتریشکە دایە .

هەروەکو تریسکەی شمشێرەکان ،

لە کانەبەردەخەلوزیەکان‌و لەدەزگای بەندەرە گەورەکانی پڕ لە ژاوەژاو ، ئەبریسکێتەوە .

لەپیســـایی‌و ئاســـــن ، درەختە زل‌و ژەهردارەکەی ئاســـمان ، ســـــەولەجانێکی لەگەلاکان ، هـەلـگرتوە ، وەك نوزەی پیرێـــك لە سەرگوزشتەکانی ( ساگا ) :

« تۆ ئەی ئەوەی ، گەرداو شۆردتی ، ئـەی پاك ، ئەی هەمیشە پاراو ... »

خواوەندەکان دەموچـاوت ئەگەڕێننەوە .. ئاگری ئاگردانەکانیش خرۆشانت .

ئا ئەوەتا ، تۆ لەم سوچەی ، ئەم چاخەدا ، نیشتەجێیت .

لەژێر بروسکەدا ،
بۆ چاخێکی نزم بانگت بۆ راهێلرا بوو،
ئەو چاخەکەی لێرەدا ، ئەکوژێتەوە !
خێراکەن ! خێراکەن !
ئەی وشەی گیاندارەکان ! دور نیە :

باپیرەکـانت لەســـــەر تەختی پاشـــایی

لەسەرشان هەلگیراو ، لەتەکتا بن !

ئایا وای نابینی ، کە لەپڕێکا ، هەمو شـــتێ خاپوورکەرانە ، روبەڕومـــان ئەبێتەوەو هەمـــو دارپەردەی پاپۆڕەکان‌و هەمو شـــتێ ، ئامـــرازە یەدەگەکانی پاپۆڕو رووی دارپەردەی پاپۆڕەکان ، پەردەکـــان ، تا بەدەموچاویشـــمان ئەگـــات ، خاپوور ئەکات ،

وەك بـــەرزبونی بڕوایـــەکی مردو ، وەك پاتالێکی گەورەی جلێکی بۆش‌و روپۆشـــێکی ساختە .

« ئایا لە ئەنجاما ئێســـتا ئەوکاتە نەهاتوە ، تاکو : تەورەکە لەپردەکە بدەین ؟ »

دیوارەکـان بڕوخێنین ، پـەیکەرەکـان .. تۆوتوێژالی گژوگیا تازەکە ! ..
لە بازنەی زەویە فراوانەکەشدا ،
ئارامێك لەنێو دلی دۆزەرەکەدایە .
شالاوە ئایدیۆلۆژیەکان ، سەرسامەمان ناکەن .
خێرابن ! خێرابن !

گۆشـەکان نەشونما ئەکەن ! ... لەلالانەوەی ئەو شتانەی کە نەشونما ئەکەن ، ئایا سەبارەت بە ئێمە دەنگی ئاوازێکی تازە نیە ؟

ئێمە ئـەی ئایدیۆلۆژیســـــــتەکە ، بـۆت لەروانگە داین !

وەك ســـــــرودی بۆڕی ( توبـا ) یـەك ، لەبەرزبونەوەی ئامرازە فووپیاکەرەکاندا .

گەر مرۆڤی بەهرەدار ، گولاوپژین‌و نـازی رەوانی گیتاری هەلبژارد ، ســـەگەکان پارچـە پارچەی ئەکەن .

* * *

لەخوانی ئارگۆنی ئازارەکانا ،
ئەی شای گۆرانی ، بلالێرەوە !
تۆش ئەی شاعیرەکە ،
ئەی ئەوەی جارێ بەدواکـەوتن‌و چوارجار بەسەرکێشی ، گوناهبارکراوی ! عەشقی گـــەرم هێشتا لەنێو بادایە ، تۆش ، گۆرانی لەسەر ئاوە پیرۆزەکانی تیفۆن بلێ .
... « تۆ ئەی کەنارەکانی پاشەرۆژ ..
تۆ ، ئەی ئەوەی ئەزانیت ،
کەی کارەکانمان دەس پێ‌ئەکا ،
لە چ جەســـــــتەیەکی نوێدا ، خواوەندکانمان رائەپەڕن ،
چارپایەیەکی زۆر قایممان بۆ ئامادە بکە ...
بایەکان بەهێزن ! بایەکان بەهێزن !
گوێ بۆ ئەو گەرداوە شل‌کە ،
چۆن تاشەمەڕمەڕی ئێوارەکان ئەکێلێ .

تۆش ئەی ئەو ئارەزووەی کە :
لەژێر رکێفی پێکەنینو لاسکەلاسکی لەززەتدا ،
گۆرانی ئەچری ،
ســــەرلەنوێ ئەو بۆشـــــاییەی کە بۆ گۆرانی
تەرخانکراوە ، بپێوە .
مافی دەروون لەسەر لەشا زۆرە .
با رەنجمان پێبدات !
با جوڵانەوە ، بەهێز ، زۆر بەهێز
بــۆ ســـــنوورەکانو ئەوپـــەڕی ســــنوورەکان ،
بمان هاژوا !
لابردنی سنوورەکان ، پەیکەرەکان ...
ئارامێك لەنێو دڵی دۆزەرەکەدایە ،
لەبازنەی زەویە فراوانەکەشدا ،
ئادەمیزاد یەك تاقەهاوارێ
وەك گۆرانیەکی ژەنینی دەم توبا
دەئاخنێتە نێو ( بــا ) وە ..
نیگەرانییش ،
سەرلەنوێ باڵی بەسەر هەمو لایەکا کێشاوە ...
ئەی جیهانی شتە تێکراکان ... »

* * *

زەریاکانی ژێر رکێفی ئێوارە ،
وەك ناڵەی گیانەوەرە قورسو خنکاوبەشیرەکانیان،
بێزارن .
کەنارەکان ، لەنێو گژوگیا جوانەکان ئەچرپێنن ،

ئەم هەمو بزوتنەوە مەزنەی مرۆڤیش بۆ کار .
لەسەر قەراڵیچە فراوانەکەی گیانەوەران ،
لەنێوان گژوگیای نێو قومو زیخەکاندا ،

ئەم بزوتنەوەی ، کە زۆر لەتەمەنی ئێمە فراوانترە!
... تا ئەم نوختەیەی دورکەوتنو بێدەنگی ،
لەوساتەی کە ( کات ) هێلانەی خۆی ،

لەنێو خوودەیەلی ئاسنینا ئەکاتو
سێ پارچە کاغەزی وونبووش ،
لەدەوری ئێبـقانۆچکەی شاژنێکی مردودا ،

دواخول ئەخوا ...
تا ئەم نوختەیەی زۆنکاوەکانو فەرامۆشی ،
لەشوێنێکا ، کە پەناگەو بوونوبەرامەشە ،

کاتێ کە نۆمیانوسی روون ،
گەلازێرینەکانی نێو رۆنە پیرۆزەکان ئەدرەخشێنێ-

شاعیرەکەش ،
لەدرەوشاوەترین قەوزە ، چاو گیرئەکات .

* * *

سەرچاوەکان :


١ - في الشعر الاوربي المعاصر - الدكتور عبدالرحمن بدوي .
٢ - الاقلام - ٥ - ١٩٧١
٣ - الفكر العربي المعاصر - ١ - ١٩٨٠




# لەئاگردانی خۆشەویستی

■ نیشتە خانـــا

■ عمر فارس

— ١ —

هۆ نیشتە خان
ئەی دەست کردی خوای جوانی
ئەگەر بۆ سەیری پیشانگای برینیش بێت
تاقە جارێ
لەناخی ئەم دەروونە خوێناوی‌یەی منت ئەڕوانی
جا ئەوکاتە
هۆی سیاپی‌و لەت‌لەت بوونی
دڵی دلدارت ئەزانی
ئیتر هەرگیز سەرزەنشت نەئەکردم :
**— بۆ وا ئالوودەی گریانی ..**

* * *

— ٢ —

هۆ نیشتە خان
دوێ شەوبینیم
ئاروان کوزەو هەرحەوت برای ئەستێرەکان
زەردەخەنەو نازی تۆیان بەکۆلیانادا بەستبوو
بەهەرحەوت چینی ئاسمانا ئەیان گێڕان
لەهەر شوێنێ قەترەیەکی نازت ئەڕژا
ئەو شوێنە ئەبووە گوڵستان

**ووتم : خوزگە باڵم ئەبوو**
**هەڵئەفڕیم بەرەو ئاسمان**
**یەکێ لەو گوڵستانانەم**
**بۆخۆم لەگرد بەنیشتمان**

— ٣ —

هۆ نیشتە خان
دوێنێ بینیم
شەقامێکت وردە ... وردە .. ئەڕنیەوە
من دووات کەوتم ... هەر ئەڕۆشتی
لەدووای تۆوە
درێژایی شەقامەکە بووە چڕە دارستانێ

**تۆم لێ وون بووی**
**منیش دووای تـۆ**
**دارستانم کردە دۆزەخ خۆم تیا سووتان**

* * *

— ٤ —

هۆ نیشتە خان
نازانم بـۆ ؟
ڕەنگی زەردو

جەستەی سووتاوم بەکڵپەو گڕی عەشقت
جارێ دڵت ئاووروو ژێنن
تاکو بم‌کەیت بەدەسگیران



— ٥ —

هۆ نیشتە خان
کە حەلاجیان سێدارەدا
لاشەکەشیان بزمار ڕێژکرد

چونکە عەشق خوێنی جگەری مژی بوی
خوێن لەدەمی برینی‌یەوە سەری نەکرد

خۆ عەشقی تۆش
دەروونمی سووتاندوەو
دووا چۆڕی خوێنمی مژیوە

بۆیە ئێستا
سەراتاپام چەقۆ ڕێژکەن

چلکو زووخاوی دڵ نەبێت
هیچ لەدەمی زامەکانمەوە سەر ناکەن

* * *

— ٦ —

هۆ نیشتە خان
خۆت ئەزانی
ئەگەر سووتاو قوومیکی ئاو بخوانەوە

دەست لەملی مردن ئەکات
.نی سووتاوی شۆخی‌ی تۆ

ئەو ئا بەیان
ئاوی کانی‌ی هەردوو چاوم ئەخۆمەوە
تا بمرمو ببمە قەزاوگێری بالآت

* * *

•

(١) نیشتە : کوورت کراوەی ناوی (نیشتمان )ە

ئەم کورت کردنەوەیە لە زمانی کوردیا زۆر
باوە بەتایبەتی بو خوشەویستی .

شیعرو چیرۆك گرنگترین دوو لقی ئەدەبن ، شاعیر کە شیعرێ دەنووسێ دەیەوێ بەشیعر شتێ بگێڕێتەوە وەك چۆن چیرۆك نووسیش هەر شتێ دەگێڕێتەوە بەڵام بەپەخشان بۆیە شتێکی سەیر نیە شاعیر چیرۆك بنووسێ ، شاعیرانی کوردیش وەك شاعیرانی زۆربەی گەلانی جیهان چیرۆکیان نووسیوە ، ( پۆشکین )ی باوکی ئەدەبی رووسی وەك گەورەترین شاعیری رووسە کۆمەڵێ رۆمانیشی نووسیوە ، هیگۆی شاعیری گەورەی فەرەنسا کە - بێنەواکانی - نووسی گەورەترین رۆمانی لەدوایی خۆی بەجێهێشت ، نازم حیکمەت جگە لەوەی لە بواری دەقی شانۆیی‌دا هەنگاوی گەورەی ناوە رۆڵێکی گرنگیشی لە پێگەیشتنی کەمال تایەردا بینیوە کە یەکێکە لەرۆمان نووسە ناودارەکانی تورك .

شاعیرانی کوردیش لەبواری چیرۆك نووسیندا هەوڵێکی گرنگیان داوەو شوێن پەنجەیان بەچیرۆکی کوردی‌یەوە ئاشکراو دیارە ، هەر دوای جەمیل سائب کە یەکەم چیرۆکی هونەری کوردی‌ی لە ١٩٢٥ دا نووسی بە دووساڵ شاعیری مەزنی کورد ئەحمەد موختاری جاف چیرۆکی مەسەلەی ویژدانی نووسی ئەو کارە گەورەیەی ئەحمەد موختاری جافو هەوڵەکانی پیرەمێردی شاعیر هەر لە سەرەتای سی‌یەکانەوە ئەوە دەسەلمێنن کە شاعیرانی کورد نەك هەر ڕۆڵێکی گرنگیان دیوە لەگەشەپێدانی چیرۆکی کوردی‌دا بەڵکو لە سەرهەڵدانیشی‌دا ، پاشان لە چلەکانیش بەدواوە شاعیران دەست بەرداری چیرۆك نەبوونو هەر سوور بوون لەسەر هەوڵ دان بۆ بەرەوپێش بردنی لەوانە شێخ سەلامو بەختیار زێوەرو هاوار دوای ئەوانیش کامەران موکری‌و دیلان‌و ا.ب. هەوری‌و خالد دلێرو مەدهۆش ، ئەم هەوڵە تائێستاش هەر بەردەوامەو شاعیرانی کورد لەحەفتاکانیشدا هەر ئاوڕیان لەجیهانی چیرۆك داوەتەوە ، ئەم نووسینەی منیش ئاوڕدانەوەیەکە لە کۆمەڵێ لەو چیرۆکانەی لە لەدوای ساڵی ١٩٧٠ وە بڵاو کراونەنەوەو نووسەرەکانیان شاعیرن .

* * *

دلشاد محەمەد ئەمین یەکێکە لەو ئەدیبانەی دەسەڵاتیان بەسەر لقێ زیاتر لە لقەکانی ئەدەبدا دەشکێ ، دلشاد شاعیرە بەڵام چیرۆك نووسێکی بەتوانایشە نەك هەر ئەمە بەڵکو یەکێکە لەچیرۆك نووسە سەرکەوتووەکان .

یەکێ لەمەرجەکانی چیرۆکی سەرکەوتوو ئەوەیە تا ماوەیەکی دوورو درێژ لەیادی خوێنەر ناچێتەوەو ڕووداوو هەڵس‌وکەوتی پاڵەوانەکانی لەیادی خوێنەردا دەژی ، ئەوەی دەساڵ لەمەوبەر بەڵکو پتریش کوێرەوەری بلەی خوێندبێتەوە یادگاری چیرۆکەکانی لەپەردەی بیری‌دا کاڵ نەبوونەتەوە ، خوێنەر کە چیرۆکێکی وەها سەرکەوتوو دەخوێنێتەوە واهەست دەکا خۆی لەگەڵ ڕووداوەکاندا ژیاوەو پاڵەوانانی چیرۆکەکە وەك کەسانی راستەقینەی تر دەناسێ ، دلشاد یەکێکە لەو چیرۆك نووسانەی چیرۆکەکان لای خوێنەر یادگارێ بەجێ دەهێڵن‌و لەیادی ناچنەوە، محازەرەیەك دەربارەی کورتە چیرۆك‌و جووجەو بووکەخان[1] پشتگیری بۆ چوونەکەم دەکەن‌و وای بۆ دەچم دلشاد لەبواری چیرۆك نووسیندا لە هەموو ئەو شاعیرانەی لەشەستەکانەوە چیرۆك دەنووسن بەدەسەلات ترە ، بۆیە جێی خۆیەتی لە هەمووان زیاتر گرنگی بەچیرۆکەکانی بدەم ، بەڵام کەتەنیا ئاوڕ لە بووکەخان‌و محازەرەیەك دەدەمەوە داوای لێبوردن دەکەم .

هەرچەندە شنۆ پاڵەوانی چیرۆکی بووکەخان منداڵێکە لە یەکەم قۆناغی تەمەنی دایە بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنێ کە دلشاد چیرۆکی منداڵانی نووسی‌بێت ، چیرۆك نووس وەك شارەزایەك لەجیهانی منداڵان سەربەستی داوە بەپاڵەوانەکەی

# ئەو شاعیرانەی

# چیرۆک دەنووسن

■ حەمە سەعید حەسەن ■

کە وەك شنۆی منداڵ بیر بکاتەوەو قسە رەفتار بکا نەك قســـــەو رەفتارو بیرکردنەوەی خۆی بەسەر ئەودا بسەپێنێ ، بۆیە کە خوێنەر هەست دەکا شنۆ خۆی بیر دەکاتەوەو دێتە قســـــەو دەجووڵێتەوە زیاتر قەناعــــەت بەرووداوەکـــان دەهێنێو لە راستگۆیی چیرۆك نووسیش ناکەوێتە گومانەوە ، مەحالە چیرۆك نووسێك شـــارەزایی لە ســـایکۆلۆژیای منداڵدا نەبێتو بتوانێ وەك دلشاد مامەڵە لەگـەڵ منالدا بکات ، هـەر ئـەم شارەزاییو لێهاتوویەیە وایان کردووە شـــنۆ پاڵەوانێکی راستەقینە بێتو خوێنەر بەتاســـەوە دوای بەسەرهاتەکان بکەوێت .

دلشاد لەبووکەخان دا ئەو باوکانە تاونبـــار دەکات کە گوێ لە منداڵـــەکانیان ناگرنو وەڵامی پرسیارەکانیان نادەنەوەو خواستو ئارەزووەکانیان پشت گوێ دەخەن ، ســـەرنجی باوکان بۆ ئـــەوە رادەکێشێت کە منداڵە ( حەساسە ) ، منـــداڵ

هەســــت بەگەلێ شتی ووردو بچووك دەکاتو هەموو رەفتارێکی ســــلبی لەگەڵیدا بەزیان دەگەرێتەوە بۆ سەراپای ژیانی : ( بابە قەت گوێ لە ئێمە ناگرێ ـ شنۆ ) . لێرەدا هەڵوێســـتی سلبی باوکەکە بەرامبەر منداڵەکەی دەکەوێتە روو بۆیە شتێکی چاوەروان کراوە کە ئەم هەڵوێستە نابەجێیە بەزیان بۆ شـــنۆ بگەرێتەوە ئیتر ئـــەو ( حیوارە )ی نێوان دایكو باوکی شنۆ : ( گـەر رووت بدایەتی .... ) چیرۆك نووس دەی توانی دەست بەرداری ببێت چونکە خوێنەر لە ئەنجامی

قســـەکانی شنۆوە بۆ بووکەکەی دەگاتـە ئـەو ( قەناعەتەی ) کەباوکەکە منداڵەکەی پشت گوێ خستووە لەکۆتاییدا باوکەکە لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی برینەوەی هەر دوو دەستی کچەکەی ویژدانی بەجۆرێ ئازاری دەدات تا دەگاتە ئەوەی کۆشکی وورەی دەرووخێو بەفیشـــــەکێ نامەی مردنی خـۆی دەنووسێ هەرچەندە تاوانی باوکـــەکـــە ئەوەندە گـــەورە نیە ـ چونکە لە ( وەعی )یـــەوە نەبووە ـ ئاســـزاکەی ئەوەندە گران بێت بـــەڵام دلشـــــاد ئەوەندە بەســـــەر ( مەساری ! ) چیرۆکەکەیدا زاڵە خوێنەر بە قەناعەتەوە ئـەو ئەنجامە وەردەگرێو بە کۆتاییەکی دروست کراوی نازانێت .

دلشـاد لە ( محاورەیەك ) دەربارەی کورتە چیرۆكو ( سۆوەت )دا لە رێی (محاورەیەکەوە) لە سەر کورتە چیرۆك رووناکی دەخاتە ســــەر ئەو شێوازانەی رژێمە دیکتاتۆرییەکان دەیگرنە بەر لەپێناوی ســـــــەرکوت کردنی ئەوانەدا بەرهەڵستییان دەکەن بە مەبەستی پتەو کردنی دەســـــەڵاتی خۆیـــانو پاراستنی بەرژەوەندی چینایەتییانو درێژە پێدانی تەمەنی حوکمەکەیان، چیـــرۆك نووس ئـــەوە روون دەکـــاتەوە کـــە دیکتاتۆرەکان لە پێناوی گەیشـــــتن بە ئامانجی خۆیاندا هەموو رێیەك دەگرنە بەر بە چاو پۆشین لـــە جۆری ئەو رێیەی پێیدا دەگەنە ئامانج ، بۆیە هەرکەسێ دژی بەرژەوەندی چینایەتییـــان بوەســـــتێ هەر هیچ نەبێ لـــە کاتی بەرینەوەی بە شەقامێکدا ئۆتۆمبیلێك پانو پلیشی دەکاتەوەو ئەوسا کوشتنەکەشی بەقەزاو تەدەر لـــە قەڵەم دەدرێ ، ئەم چیرۆکە نەك هەر ســـەرەکی ترین کێشـــــەی ئەم چەرخە دەخاتە روو بەڵکو پەردە لەسەر رووخساری ناشیرینی چەوســــێنەران لەهەرکوێیەك بن لائەداتو ئەو پێستە مرۆڤانەیە دانەماڵێ کە لەدیوی دەرەوە دای پۆشیونو دیوی نـــاوەوەیـــانە ، جەوهەریان وەك گەلـــە گورگێکی برسیو چاوچنۆك دەخاتە روو ، دلشاد نەهاتووە تەنیـــا واقـــع شی بکاتـــەوەو هیچی تر بـــەڵکو چیرۆکەکەی تەرخانە بۆ هاندان بە مەبەســــتی گۆرینی ئەو جیهانەی کە چەوســــێنەران تێیدا سەروەرن ، چیرۆکەکە هەرچەندە شوناسنامـــەی خۆی پێیە بـــەڵام پەیوەنـــدییە ( عوزوییەکەی ) نێوان نەتەوایەتیو نومـــــەییەتی تێدا پارێزراوە بۆیە هەرچەندە چیرۆکەکە رەنگدانەوەی واقعێکی دیاری کراوە بەڵام لە هەرچێیەك خەمەکان لەخەمی



واتعی چیرۆکەکەی دلشاد بچن خەلکی ئەو جۆرە چیرۆکەکە بەهی خۆیان دەزانن ، دواجار بە دلنیاییەوە دەلێم ئەم چیرۆکە هەولێکی سەرکەوتووە بۆ نووسینی ئەدەبی ریالیزمی شۆڕشگێڕانە ، ئەو شێوە تەکنیکەشی دلشاد فیکری چیرۆکەکەی پێ دەربڕیوە شێوەیەکی تازەی تایبەتە بە دلشادو لەڕاژەی گەیاندنی فیکری چیرۆکەکەدایە .

لە چیرۆکی ( تا هەتاو نەکەوێ )ی نەجیبە ئەحمەدیش دا[٢] دیسان ئۆتۆمبیلێك ئینسانێك دەشێلێ هەرچەندە پالەوانی ئەم چیرۆکە دژایەتی ڕژێمەکەی نەکردووەو تاوانی کوشتنەکەشی بەشێوەیەکی راستەوخۆ لە ئەستۆی ڕژێمەکەدا نیە ، بەلام ئەم پالەوانەش هەر قوربانیی دەستی ئەو شێوازی بەرهەم هێنانەیە کە ڕژێمەکەی راگرتووە ، کچێك کە تەمەنی لە دەسال کەمترە ناچار دەبێت گولە بە ڕۆژە بفرۆشێت ، لە ڕۆژێکی تۆفدا کە بیر لە کراسێکی نوێ دەکاتەوە سەیارەیەك دەی‌شێلێ‌و گولە بەڕۆژەکەی لە شەقامەکەدا دەبێ بە تۆو ، بۆیە دەلێم تاوانی کوشتنی ئەم کچە لە ئەستۆی شێوازی بەرهەم هێنانەکەدایە ، چونکە لەسایەی شێوازی بەرهەم هێنانێکی دوور لە چەوسانەوەدا منداڵ نەك ناچار نابێت کاربکات بەلکو ئیش‌کردن بە منداڵ تاوانێکی گەورەشە ، منداڵ لە کۆمەلگایەکدا مولکایەتی تایبەتی تێدا گۆڕ کرابێت وەك شازیان دەبالە سەرو هەموو دەرگاکان لەبەردەم خواستەکانی‌دا لەسەر گازەراری پشتن .

ئەم چیرۆکەی نەجیبە وەك فیکر مۆری تاوانبارکردن بە ناوچاوانی هەموو ئەو ڕژێمانەوە دەنێت کە لەسەر بناغەی چەوساندنەوەی ئینسان دامەزراون وەك شێوەش سوودی لەتەکنیکی نوێ وەرگرتووەو سەرکەوتووانە رەخساندوویەتی لە پێناوی گەیاندنی فیکری چیرۆکەکەی‌دا، لەکاتێکدا منداڵە گولە بە ڕۆژە فرۆشەکە لەناو سەرما هەڵ دەلەرزێ‌و پەنجەکانی لەگۆ کەوتووە ژنێك

بەم جۆرە منداڵەکەی بانگ دەکات : ( ئازاد گیان دەوەرە ژوورەوە سەرمات نەبێت ) . نیشان دانی ئەم دوو دیمەنە ناکۆکە شارەزایی چیرۆك نووس نیشان دەدات چونکە توانیوێتی لەڕێی ئەو رستە بچووکەوە کۆمەلێ شتی گەورە بلێت، کە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەش بڕیاری قەدەغە کردنی قەزوان‌و گولە بە ڕۆژە فرۆشتن دەردەکات ، فەڕاشەکە زیاتر هەست بە ئازاری منداڵەکە دەکات بۆیە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ منداڵەکە لەو بڕیارە ئاگادار دەکات : ( کچی خۆم ئێستا ساردە تۆش منالیت بەرگەی ئەم سەرمایە ناگریت ، بچۆرەوە مالەوە کە خۆر دەرکەوت ئەوسا وەرە دەرەوە ) . لێرەشدا دیسان توانای چیرۆك‌نووس ئاشکرا دەبێت چونکە دەری بڕیوە کردووە کە فەڕاشەکەو کچەکە هەردووکیان سەر بە بەرەیەکن بۆیە فەڕاشەکە لەخەم‌و ئازاری کچە گولەبەڕۆژە فرۆشەکە دەکات ، یەکێ لە خالە لاوازەکانی ئەم چیرۆکە ئەوەیە کە بابەتەکەی شتێکی نوێ نیەو پێش نەجیبە گەلێ چیرۆك نووسی تر پالەوانەکانیان منداڵێکی کاسب بووە ، وەك لە دەڕابە چەور کەرەکەی تایەر سالح سەعیدو[٣] منداڵە سەمون فرۆشەکەی زاهیر ئەحمەد سەوز[٤] دا دەرئەکەوێ .

پالەوانی چیرۆکی نیو بیتاقەی لەتیف هەلمەت[٥] حەمالێکە بیر لەکڕینی بیتاقە دەکاتەوە بەنیازی ئەوەی کەبۆی دەرچوو موغازەیەك بکاتەوە ، بەلام گیرفانی یارمەتی کڕینی نیو بیتاقەش نادات ، لەتیف توانیوێتی ئەوە بخاتە روو کە حەمالێك چەند رەنج دەداتو ئارەق دەڕێژێ ئەچی هەر ناتوانێ پێویستی‌یە ساکارەکانی ژیان دابین بکات ، دیارە لە کۆمەلگایەکی دواکەوتوودا ئەم پالەوانە خاوەنی هۆشیاری‌یەکی وەها نیە تابزانێت بۆچی ژیانی ئەوەندە نالەبارەو بەچی لەو ژیانە کولەمەرگی‌یە رزگاری دەبێت ، بۆیە لە نەبوونی هۆشیاری‌یەوە پەنا دەباتە بەر

خەیاڵ پلاوی بیناقە ئەو مۆڕنینەی دامو دەزگای چەوسێنەران بەمەبەستی رووتاندنەوەو رەنجدەران دەی هێننە کایەوە بۆیە ئەوەی وایان لێبکات بیر لەچارەسەرێك نەکەنەوە بۆ دەرباز بوون لەو ژیانە نالەبارەیانو هەمیشە خەیاڵیان دەرچوونی بیناقەیەك بێتو وابزانن کلیلی بەختیان لەقوڵی مشتی بیناقەدایە .

لەم چیرۆکەشدا دیسان منداڵێك خەریکی کاسبییەو بیناقە دەفرۆشێ ، لەئیف لەرێی نیشان دانی گوزەرانی خێزانی حەماڵێکەوەو ناچار بوونی دایکێك کە بەوەڕازی بێت منداڵەکەی بیناقە بفرۆشێت ئەو شێوازی بەرهەم هێنانە رەتدەکاتەوە کەهۆی بنەڕەتی ژیانی بێدەرامەتی ئەو دووخێزانەو هەموو خێزانە رەنجدەرەکانی ترە ، لەئیف تەنیا پەروەی لەسەر رووی چۆنێتی پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان لابردووەو هیچیتر ، وەنەبێ ئەمە لەوەهاتبێ کە چیرۆك نووس شێوازی چارەسەرکردنی کێشەکەی لەلا روون نەبێت ، بەڵکو هۆکەی ئەوەیە کە لە چیرۆکەکەدا هەست بەبوونی چیرۆکنووس ناکرێت ، چونکە پێویست بوو چیرۆك نووس دەربارەی کێشەی چیرۆکەکە ڕای خۆی هەبووایە ئە ئەمە دەڵێم مەبەستم ئەوە نیە چیرۆك نووس بەشێوەیەکی راستەوخۆ بیروڕای خۆی بسەپێنێ بەسەر کەسانی ناوچیرۆکەکەدا ، بەڵام ئەمە ئەوەش ناگەیێنێ کە چیرۆك نووس رۆڵی نەبێت لەدیاری کردنی رەوتی چیرۆکەکەداو تەنیا وەك ریپورتاژ نووسێك چیدەبینی بیخاتە سەر قاقەز . ئەوی لەم چیرۆکەدا زیاتر سەرنج ڕادەکێشێ توانای چیرۆك نووسە لە بواری نیشان دانی ناخی حەماڵەکەدا کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شارەزایی لەئیف لە (سایکۆلۆژیای رەنج دەران !) لەئیف وەك ئەکنیك سوودی لەگێڕانەوەو مەنەلۆژ وەرگرتووەو جێگەی سەرنجە چیرۆکەکە ( حیواری ! ) تێدا نیە .

ئافرەتێکی فەیرە کە ( شزوزی ! ) هەیەو بۆ دامرکاندنەوەی ئالۆشەکەی پەنا دەباتە بەر پشبلەش پاڵەوانی چیرۆکی ( کلاوقوچ )ی ئیسترکۆ بێکەسە[٦] ئەو ئافرەتە بەئومێدی شووکردن دەست بە داوێنی شێخەوە دەگرێتو چاوەڕێی هیمەتی نوشتەیە ، چیرۆکەکە لەسەر شێوەی ریپۆرتاژ نووسراوەو چیرۆك نووس بەوپەڕی ئەمانەتەوە شتەکانی خستۆتە قاڵبی چیرۆکەوە تەنانەت قاوەخانەی سەر چیمەنو کابرا لووت براوەکەشی لەیاد نەچووە - هەرچەندە باسکردنی ئەو کابرایە بەوشێوەیە جێی خۆی نیە

چونکە هێشتا لە ژیاندا ماوەو .... - چیرۆکەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی وێنە گرتنێکی بێ رتووشی واقعە کەچی لەدوا پەرەگرافدا بەتۆبزی رەمزێکی ( نامەفهووم )و ناماقووڵی تێدا قوت کراوەتەوە

( پاسی ژمارە ٩٤٨ هاتو سەرکەوتم ) بەبارە واقعییەکەیدا پاسی ژمارە ٩٤٨ تا ساڵی ٩٧٨ کە چیرۆکەکەی تێدا نووسراوە لە سلێمانیدا ئەو شارەی شوێنی رووداني چیرۆکەکەیە نەبینراوە کەواتە ٩٤٨ رەمزە ، بەڵام رەمزە بۆ چی ؟

تۆبڵێی رەمز بێت بۆ راپەڕینەکەی کانوونی ٩٤٨ کە پەیمانی پۆرتسمۆسی نایە گۆڕەوەو بووە هۆی کەوتنی وەزارەتەکەی سالح جەبرو یەکەم پرۆڤە بوو بۆ شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ ؟! ئەمەیان جێی گومانە چونکە ئەو ڕاپەڕینە لەوە گەورەترە تەنیا وەك رەمزێکی ( نامەفهووم ! ) لە کۆتایی چیرۆکێکی وەهادا جێی بکرێتەوەو کەرەسەی رۆمانێکە ، ئەمانە جگە لەوەی کە تائێستا نەبووە

چیرۆکێك لەسەرەتاوە تا دێڕەکانی دوایی تەواو واقعی بێت کەچی دواجار رەمزێ خۆی قوت بکاتەوە ، ئەگەر ئیسترکۆ وا هەست دەکا لەسەر شێوەی پەنا بردنە بەر رەمز چیرۆکی نووسیوە ئەوا بەهەڵەدا چووە ، چونکە چیرۆکەکەی نە رەمزییەتێکی شێوە ئەفسانەیە ، نە رەمزییەتێکی

•

ئارمایی ناهێزە ، رەمزییەتێکی واقعییە[٧] کۆتایی هێنانیش بەژیانی پاڵەوانەکە بەو جۆرە ناماقووڵە کە تەنیا مەبەست ختووکە دانی عاتیفەی خەڵکییە

خوێنەر لەراستگۆیی چیرۆك نووس دەخاتە گومانەوە ، بەلابردنی دوا پەرەگرافیش نەك هەر کەلێن ناکەوێتە چیرۆکەکەوە بەڵکو چیرۆکەکە لەکەناری راستەقینەی خۆیدا ئارام دەگرێ .



هەرچەندە گێڕانەوەی چیرۆکەکە لەشێوەیەکی نوێدایە بەڵام بابەتی چیرۆکەکە شتێکی سواوەو لەمەداری ئافرەتو نوشتە کامل ژێرو نووشتەکەی ئامینە خانی حەسەنی قزلجیو فالچی حەمە کەریم رەمەزان هەورامیدا دەسوورێتەوە ، ئێرکۆ کەوتۆتە غەفلەتێکی وەهاشەوە کە چاوەڕێ ناکرێ ، لەکاتێکدا منداڵەکە ئەوەندە گەورەیە ، تواناى ئەوەی هەیە ئاوێنەی پێش بووك هەڵبگرێ کەچی سەری لەوە دەسوورێ چۆن باجی ئامە منداڵی نیە هەرچەندە ئاگاداری ئەوەیە کە باجی ئامە شووی نەکردووە ، من لەوبڕوایەدام کەسێ ئاوێنەی پێش بووك هەڵبگرێ عەقڵی بەوە دەشکێ ئافرەت تامێردی نەبێت منداڵیشی نابێت .

پاڵەوانی چیرۆکی ( ئەو شەوانەی بۆت ئەگریمو ئەو ڕۆژانەی لەبیرم ناچینەوە )ی عبداللە عباس(٨) فەرمانبەرێکی بچووکەو شاعیریشە ، خولیای ئەو هەراسانی دەکاتو بەدەم خواردنەوەوە ڕازی دڵی بۆ دیجلە دەردبڕێت ، ئەم پاڵەوانە

بۆرژووایەکی بچووکە فیکریشی ڕەنگدانەوەی واقعە کۆمەڵایەتییەکەیەتی بۆیە تەنگو چەڵەمەو هەڵسوکەوتو چارەسەرەکانی تەعبیر لەجێ پێی چینایەتیو بنەمای فیکری بۆرژووای بچووك

دەکەن ، پاڵەوانەکە هەرچەندە خاوەنی ژنو منداڵە کەچی حەزی لە ئافرەتێکی ترە ، ئەمەش لەوەوە هاتووە کە سەربەست نەبووە لەهەڵبژاردنی

هاوسەرەکەیدا بۆیە ڕاڕاییو پەشیمانی لەدەروونیدا سەر هەڵئەدەنو شتێکی سەیر نیە کە لە ژیانی خێزانێتیدا بێزارەو زوو زوو دڵ دەگۆڕێ، بەمەبەستی سووك کردنی باری گرانیشی پەنا دەباتە بەر خواردنەوە ، جێی سەرنجە وەك چۆن نووسەری چیرۆکەکە شاعیرە ،

پاڵەوانەکەشی هەر شاعیرە بۆیە دەگونجێ خوێنەر بیری بۆ ئەوە بچێ کە عبداللە عباسی شاعیری نووسەری چیرۆکەکە ، پاڵەوانی چیرۆکەکەشە ،

لێرەدا ڕوو دەکەمەوە ئەوانەی کەواتێدەگەن ڕاستگۆیی لەوەدایە کە چیرۆك نووس یا شاعیر بەرهەمەکانی ئاوێنەی ڕاستەقینەی هەڵسوکەوتو تەنگو چەڵەمەو ئاواتو خواستی شەخسیی خۆی بن کە ئەمە ئەوپەڕی ( ئێرجسییەتە ) ، یان لەچاکترین حاڵەتدا تەعبیرێکی فۆتۆگرافییانەیە لە واقعێکی مەییو ،

لای من راستگۆیی ئەوە نیە کریم الناصری لە الوشمدا ئەوە دەگێڕێتەوە چۆن لەگەڵ یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی واقعە تاڵەکەدا دەڕووخێو حەز لەچەند ئافرەت دەکاتو چۆن لەگەڵیاندا ڕادەبوێرێ ، راستگۆیی ئەوەیە عبدالرحمن مجید الربیعی بیتوانیایە کارێ بکات بەرهەمەکەی لە

خزمەتی ڕەوتی مێژوودا بێت ، لەخزمەتی بنیاتنانی جیهانێکی ئاسوودەو دوور لە چەوساندنەوەدا بێت ، نەك ڕەنگدانەوەی پاڵەوانێکی کارتۆنی بێت ، عبداللە لەم چیرۆکەیدا چی وتووە لەچیرۆکی ڕۆژێ هەموو ڕۆژێیشدا(٩) هەرهەمان

ستی دووبارە کردۆتەوە ، چ وەك کێشە چ وەك پاڵەوان ، چ وەك چارەسەر تەنیا گۆڕینەکە لەوەدایە ژووری دائیرە بۆتە ژووری نووستن دیارە کورسیو مێزەکەش دەبێتە سێیەم .

عبداللە عباس لە هەردوو چیرۆکی وەلامو(١٠) ژانی دڕك یشدا(١١) هەردوو پاڵەوانەکەی هەریەك شەخسییەتن ، کۆمەڵی ناکۆکی لە ژیانیاندا کۆبۆتەوەو خەریکی وڕێنەنو لەوە دەچێ شیزۆفرینیایان بێت : ( حەزی دەکرد وەلامەکە بزانێ کەچی حەزیشی نەدەکرد ،

نەخۆشی‌و کەچی نەخۆشیش نیت ـ وەلام ) یان : ( من خالۆ درۆیەکەم هەر راست نەلێم ـ ژانی دڕك ) ، هەرچەندە پالەوانی ژانی دڕك زیاتر ڕاڕایی پێوە دیارەو لەبەرپێی خۆی بترازێ بێتێ دوورتر نابینێ بەلام پالەوانی وەلام ( نەهەڕەن )ترەو کەچاویشی بڕیدەتە ڕۆژ تەنیا

لەبەر ئەوەیە دیمەنێکی جوانی هەیە ، چیرۆکی وەلام سەرەکی ترین سیفەتی شیعری عبداللەی پێوە دیارە ئەویش کۆکردنەوەو کەلەکەکردن‌و جێ‌گۆڕکێ‌و یاری کردنە بە ووشەی دژ بەیەك ،

لەمانە سەیرتر ئەوەی لوتکەی دراما لەسێبەری دڕكدا ئەو کاتەیە پالەوانەکە پێی پەتی‌یەو دڕکێك دەچێ بەپێی‌دا ، پێش ئەوەی عبدالله بەجێ بهێلم دەلێم : یەکێ لەمەرجەکانی چیرۆکی سەرکەوتوو ئەوەیە بەجۆرێ خوێنەر ڕابکێشێت بۆ لای خۆی کە تا لە خوێندنەوەی نەبێتەوە دەست

بەرداری نەبێت ، ئەم مەرجە نەك هەر لەچیرۆکی عبداللەدا چنگ ناکەوێ بەلکو زەحمەتە خوێنەرێك هەبێت بتوانێ پەرەگرافێك لە چیرۆکێکی عبدالله تەواو بکات‌و بێزار نەبێت هەر بەنیسبەت عبداللەوە ئەگەر لەجێی پەرەگراف کۆپلەو لەجێی چیرۆك شیعر بووترێ بۆ چوونەکە هەرجێی خۆیەتی .

سەرەتای چیرۆکی چاوەڕوانی صلاح شوان[١٢] بە ( مەنەلۆژی ) ناڕاستەوخۆ دەست پێ‌دەکات ، بەکۆمەلێ رستەی بروسکە ئاسایی هەربەم شێوەیەش دەڕوات‌و جارجار ( حیواری ) تێ‌دەکەوێ ، سوودیش لە ( مۆنتاژ ) وەرگیراوە ، شوێن نەگۆڕە بەلام بیرو خەیالی پالەوانەکە ،
١٠

کە چیرۆك نووس خۆیەتی لە کاتێکی دیاری کراود، نامێنێتەوە ، بەلکو دەگەڕێتەوە بۆ دواوە بەرەو پێشەوەش دەفڕێ ، پالەوانی چیرۆکەکە مرۆڤێکی بێزارو بێ‌ئومێدە ، لەجێیەکی دیاری کراودا راوەستاوەو چاوەڕێیە ( قابی ) ( رەحمەتی ) بۆ بخرێتە سەرپشت بێ‌ئەوەی خۆی هیچ رۆلێکی هەبێت ( فیکری ) چیرۆکەکە لەوەدا کۆ دەبێتەوە کە صلاح پێمان دەلێ : هەموو ڕۆژو مانگ‌و

سالەکان وەك جەوهەر لەیەك دەچن ، ئەوی دەگۆڕێ تەنیا دیوی دەرەوەی شتەکانە ، بەمەش شتێکی نوێی نەخستۆتەڕوو چونکە هەر بۆ چوونی عەبەسی‌یەکانی دووبارەکردۆتەوە کە گوایە شەممە ، یەك شەممە ، دووشەممە ، .. هتد هەموو هەر یەکسانن بەیەك جێی گومان نیە کەسێ بڕوای بەتوانای مرۆڤ هەبێت دەگاتە ئەو ( قەناعەتەی ) کە مرۆڤ دەتوانێ هەموو کۆسپەکانی بەردەمی تەخت بکات‌و ئەم دام‌و دەزگایە بڕووخێنێ کە دەی‌کاتە بورغویەك لە ئامێرێکدا ، صلاح لەم چیرۆکەیدا تازەترین تەکنیکی بەکارهێناوە ، بەلام تازەگەری‌و نوێ کردنەوەو داهێنان ئەوەنیە تەنیا شێوە بگرێتەوە بەلکو بە پلەی یەکەم ناوەرۆك دەگرێتەوە ، بۆیە تازەگەری‌و نوێ‌کردنەوە تەعبیرکردنە لە فیکری پێشکەوتوو خوازترین هێزی ئەم سەردەمە ، دوا سەرنجم دەربارەی ئەم چیرۆکە ئەوەیە : وەك چۆن هەول دەدرێ بۆ خاوێن راگرتنی دەوروبەری مرۆڤ‌و هەموو خێر خوازێك دژی پیس کردنی دەوروبەری مرۆڤە ، ئەم جۆرە ئەدەبەش دەوری هەیە لە پیس‌کردنی بیری مرۆڤداو دژایەتی‌کردنی ئەرکی سەرشانی هەموو خێر خوازێکە[١٣] .

پالەوانی چیرۆکی رەشەڕاوی سەلام محەمەد[١٤] مرۆڤێکە گەورەترین خەمی بەتۆلەوەیە ، هەست بە ئازاری مرۆڤ دەکاو مرۆڤی خۆش دەوێ ، کە دەبینێ کەشتی بۆ گەرداو دەڕواو کا بۆ سەگ‌و ئێسقان بۆ ئەسپ دانراوە ئازارێکی سەخت چنگ لە دەروونی گیر دەکا ، ئەم واقعە تالە ناچاری دەکات نەك هەر پێشنیاز بکات بۆ چارەسەری تەنگ‌و چەلەمەکان بەلکو هەلوێستیش نیشان بدات ،

بەلام لەبەر ئەوەی لەچاکترین حالەتدا مامە خەمەیەکی تەقلیدی‌یەو هیچی‌تر بۆیە لە تێڕوانینێکی تۆباوی‌یانەوە بیر لە چارەسەر دەکاتەوەو لە پێناوی لەناوبردنی برسێتی‌دا ئەم دروشمەی بەرز کردۆتەوە : ئەی دەولەمەندەکانی جیهان دلتان نەرم بێت‌و بەزەیی‌تان بە هەژاراندا بێتەوە . ( دایە سینی‌یەك برازێنەوەو بۆ مندالە هەتیوەکانی پوورە مەنیجی بەرە ، ئەوانیش حەز لەگۆشت‌و برنج ئەکەن ) . پالەوانەکەی سەلام هەرچەندە هەست بەبرسێتی مرۆڤ دەکات بەلام

چارەسەرەکەی ئەوبەڕی میـــــــالی یانەیە چونکە هەرگیز برسی یەکانی جیهان لەڕێی خێرەوە تێر نابن و ئێشەکەیان بەو شێوەیە کۆتایی پێنایەت . هەرچەندە چیرۆك نووس لای وایە خۆشەویستی خۆی بەرامبەر چەوساوەکان نیشان داوە بەڵام لە راســـتیدا گەورەترین ( اهانەی ) کردوون کاتێ هاتووە ختووکەی هەست و سۆزی دەوڵەمەندەکانی داوە بەهیوای ئەوەی بەزەییان بجووڵێ و یارمەتی هەژاران بدەن ، من پێم وایــە چەوســـــاوەکان ( موحتاجی ) بەزەیی ورووژاندن نین و تەنیــــا گۆڕکردنی رژێمی ســـــــەرمایەداری لە هەموو بستێکی جیهاندا ژیانی ئاسوودەیی و ســەربەرزی یان بۆ مسۆگەر دەکات ئەم کارەش هەرخۆیان بە ئەنجامی دەگەیێنن و پێویستیان بــە ئامۆژگاری و بەزەیی هیچ کەس و تاقم و لایەنێکی تر نابێت .

ســـــــەلام هەندێ نـاوی گـەورەو گرانی هاویشــــتۆتە نــاو چیرۆکەکەیەوە کەپتر لــە

( عەرزی عەزەلات ! ) دەچێ ئەگینا ختێوەڵی کورتە چیرۆکێکی کوردی کـەی بواری ئـەوەی هەیـە دالدی ڤـانکـوخ و دیۆجینیوس و ئـەفلاتوون و ئەبروز بدات ، حسین عارف دەربارەی تەکنیکی ئەم چیرۆکە دەڵێ : ( شێوەی مناجات و مۆنۆلۆژە ناوخۆکە لەدەربڕینی مانار مەبەســـتدا یاریدەی زۆر داوە چونکە ئەم جۆرە تەکنیکە بڕ بەپێستی ئەم بابەتە باسانەیە )[15] . من پێم وایــە بابەتی چیرۆنەکەی ســـەلام شتێکی تەقلیدی یە بـەڵام بەشێوەیەکی نوێ نووســـیویەتی ، بۆیە نوێترین تەکنیك ئـەو باســـــە تەقلیدی یە ناکاتە کارێکی

ئەدەبی ی سەرکەوتوو چونکە ناوەرۆك شـــێوە دیاری دەکات و شێوە پاشکۆی ناوەرۆکە کە ئەمە ددڵێم وەنەبێ بەشـــێوەیەکی یەك لایەنی بڕوانمە ناوەڕۆك و چاو لە تەئـــسیری شێوە لەســـــەر ناوەرۆك بپۆشــم . هەر دەربـــارەی شـــێوەی چیرۆکەکە دەڵێم لەوە دەچێ ســــــــەلام پێش نووسینی چیرۆکەکە بڕیاری لەســـــەر شێوەکەی دابێ وەك ئەو شاعیرەی پێشەکی ( سەرواکان ) لە ژێریەکدا ریز دەکاو پاشان بۆشـــــــاییەکان پڕدەکاتەوە .

سعداللە پەرۆش لە جگەرەو تەمەنێکی تەواو نەبوودا[16] گۆمی نــاخی مرۆڤێکی رۆمـانـــــی دەشلەقێنێ ، ئەو مرۆڤە کە لەڕێی مەنەلۆژەوە ناخی خۆی دەخاتە ڕوو خوێنەر هەســـــت دەکا مایەی بەزەیی پێدا هاتنەوەیـە چونکە بەدرێژایی چیرۆکەکە ڕاڕایەو وورەی بەرداوەو باوەڕی لەق بووە ، بەڵام جێی ســــــەرسووڕمانە لە کۆتایی دا لــە هەڵوێستی دێرینی پاشــــگەز دەبێتەوەو بڕیارێکی چارەڕێ نەکــراو دەدات : ( من ئــەو جگەرەیەم هەرگیز بەمژی لالفاوی چرچی خەڵکی تر نـاســــــوتێنم ، تەواو نابم ) . ئـەم گۆڕانـە

کوتوپڕەی بەسەر پاڵـەوانی چیرۆکەکەدا دێت بێدەســــەڵاتی چیرۆك نووس دەخاتە ڕوو چونکە ئەگەر دەسەڵاتی بەسەر هونەرەکەدا بشـــکایـە دەی توانی زەمینەیەکی لەبــــاری وەهـا بهێنێتە کایـەوە ئەو گۆڕانـە ئەوەی یە لـە پاڵەوانەکەیدا جێگەی باوەڕبێت ، ئاشـــــکرایە هیچ گۆڕانێکی ئەوەی لەپڕ روونادات و بەدەست بڕیاری چیرۆك نووس نیەو کۆمەڵێ هەل و مەرج بڕیاری کاربڕی لەسەر دەدەن .

جگەرە لـەم چیرۆکـــەدا رەمزی بەردەوام بوونی ژیانە ، رەمزی تێکۆشان و وورەبـەرزی یە ، رەمزی شۆڕشگێڕێکی راستەقینەیە کـە ئەمەش دیسان بێدەسەڵاتی سعداللە نیشــــــان دەدات لەبواری مامەڵە کردن لەگەڵ رەمزدا ، جگەرە ، هەر جگەرەیە هەر دەشبێت بەسوودتوو بـەچـاو پۆشین لەجۆری توتن و کاغـــەزو فیلتەرەکەی و ئەو لێوەشی مژی لێدەدات ، جێی سـەرنجە لەوە دەچێ سـعداللە ئەم چیرۆکەی بۆ ئەوە نووسیبێت توانای خۆی لەوەدا تاقی بکاتەوە کە چەندجـار دەتوانێ ووشـەی جگەرە بەشێوەی جیا جیا بخاتە رستەوە .

لە چیرۆکی ( سێبەر )ی محسن ئاوارەدا[17] رەسوول حەوت رۆژ پشـــووی وەرگرتووەو ملی ڕێی دێیەکەیانی گرتۆتە بەر ، لە ڕێگا لەبەردەم ئەشکەوتێکدا سەعاتێك دەخەوێ و پاشان بەردەوام دەبێ لەسـەر رۆیشتن ، بۆ ئەوەی بزانێ چەند لە ئەشکەوتەکە دوورکەوتۆتەوە ئاوڕێك دەداتەوە ، دەبینێ گورگێك لەبەردەمی ئەشـــکەوتەکەدایە ، ئەمە کورتەی چیرۆکەکەیە ، من هەرچەندە لەگەڵ ئەوانەدا رێك ناکەوم کە لە هەڵســەنگاندنی هەموو کۆمەڵە چیرۆکێکدا یەکەیەکە چیرۆکەکان کورت دەکەنەوەو پاشان تاقە ســـەرنجێ دەردەبڕن یــان

نەء ، ئەو جۆرە رەخنەگرتنە تابلۆی ئاسانەو هەموو خوێندەواری پێی دەوێریّو بەکوردیەتەی مالی بێدانە . بەلام مەبەستم لەکورت کردنەوەی چیرۆکەکەی محسن تەنیا ئەوە بوو کە خوێنەر دڵنیا بێت لەوەی چیرۆکەکە رووداوی تێدا نیە هەرچەندە چیرۆك بەبێ رووداو دروست نابێت ، خۆ ئەگەر گورگەکە پەلاماری پالەوانەکەی بدایە ئەوا رووداو دروست دەبوو ، بەلام لەکاتێکدا رەسوول لەبەر ئەشکەوتەکەدا نوستووە گورگەکە لە شیرین خەو

دابووەو هیچ رۆلێکی نەدیوە کە بەمەش چیرۆکەکە بەرەو لاوازی رۆیشتووەو لەرەگەزی تەشویق بێبەش بووە ، ئەمە جگە لەوەی لێکدانەوەی چیرۆکەکە بەبارە رەمزیەکەیدا هیچ مانایەك نابەخشێ چونکە گورگ کە رەمزە بۆ هێزی شەر لەم چیرۆکەدا گیان لەبەرێکی بەستەزمانو خەوخۆشە ، بۆیە ئەگەر خوێنەر گورگەکە بەرەمزیش نەزانێ جێی خۆیەتی .

محسن وەك هەندێ جار پەنای بردۆتە بەر زمانو وێنە شیعری بۆ دەربڕینی مەبەستەکانی : ( هەوری سەرسامیو سامناکی بارانە موچرکێکی تەسەلی وەك گەوالەی بەهاران کوتابە سەر دەشتی دلی رەسووڵ ) . هەندێ جاری تر تەواو بەپێچەوانەوە رستەکانی

لاوازنو پڕ لە دووبارە کردنەوەی ووشەی هاو واتا : ( شەقاوو هەنگاوەکانی فراوانتر دەکردن ، باناوی رۆیشتنی لێبێنمو بکەومە رێ ) ، جێی سەرنجە وەك چۆن لە الشرق المتوسطی د. عبدالرحمن منیفدا جارێك رەجەبی پالەوانی رۆمانەکە ( راویەمو ! ) جارێك خوشکەکەی لەم چیرۆکەی محسنیشدا سەرەتا پالەوانی چیرۆکەکە ( راویە )و پاشان چیرۆك نووس ، محسن توانیوێتی مامەلەیەکی وەستایانە لەگەڵ ئەو شێوە گێرانەوەیەدا بکات ، یەکێ لەلایەنە بەهێزەکانی تری ئەم چیرۆکە ئەوەیە شوناسنامەی نەتەوایەتی لەگەڵ خۆیدا هەلگرتووەو مۆرکی کوردی بەسەریدا زالەو دەوروبەرەکەی دەناسرێتەوە وەك کۆمەڵو سروشت کە دەوروبەرێکی کوردەواریە .

* * *

پێش ئەوەی کۆتایی بە باسەکە بهێنم حەز دەکەم ئەوە بڵێم کە ئەم نووسینە خالی نیە لەکەمو کورتیو دوور نیە شاعیری چیرۆك نووسی تر هەبێتو ناوی نەهاتبێ ، یان ناوی هاتبێو مافی تەواوی خۆی پێ نەدرابێ ، بەلام لە هیچ حالەتێکدا مەبەستی نووسینەکە لەچوار چێوەی ڕاژەی ئەدەبی رەسەنی کوردی نەچۆتە دەرەوەو هێرش بردنی ناڕەوای بۆ سەر هیچ شاعیرێ نەکردۆتە دروشمو بەکۆتایی هاتنی ئەم نووسینەی منیش بابەتی باسەکە کۆتایی پێنەهاتووەو گەلێکی تری بەدەمەوەیە ، من بەش بەحالی خۆم ئەگەر هەلم دەستگیر ببێت ناوی لە هەموو ئەو شاعیرانەش دەدەمەوە کە لە نێوان سالانی ١٩٢٧ – ١٩٧٠ دا چیرۆکیان نووسیوە ، بەلام ئەگەر نووسەرانی تر بابەتی باسەکە سەرنجیان ڕادەکێشێ با ئەوانیش لەلای خۆیانەوە خامەی رەنگینیان بخەنەکار .

* * *

## سەرچاوەکان :


١ – بە پەنجەکانم دەتبینم – دلشاد محەمەد ئەمین .
٢ – بیری نوێ ژمارە ٢٤٣
٣ – لە گەرووی مەرگەوە – تایەر سالح سەعید
٤ – بەیان ژمارە ١١
٥ – بەیان ژمارە ٣١
٦ – رۆشنبیری نوێ ژمارە ٧١
٧ – شێوەکانی تەکنیك لە رۆکی سالەکانی دوای حەفتادا – حسین عارف رۆشنبیری نوێ ژمارە ٦٣
٨ – بەیان ژمارە ٤٤
٩ – بەیان ژمارە ٥٢
١٠ – رۆشنبیری نوێ ژمارە ٦٠
١١ – رۆشنبیری نوێ ژمارە ٦٣
١٢ – رۆشنبیری نوێ ژمارە ٦٤
١٣ – پێشەکی رۆمانی – عندما تغادر الحیتان ، یوری ریتخیو – الاقلام ژمارە ٩ ی سالی ١٩٨٠
١٤ – بەیان ژمارە ٤٠ ، ٤١
١٥ – چیرۆکەکانی ژمارەی پێشووم خوێندەوە – حسین عارف – بەیان ژمارە ٤٢
١٦ – نووسەری نوێ – گۆڤاری نووسەرانی هەولێر – سالی ١٩٧٨
١٧ – بەیان ژمارە ٦٠

کورتە چیرۆك لەفەنلەندەدا لەگەڵ هەبوونی ئەدەبدا لەم وڵاتەدا ـ واتە بەر لە زیاتر لە سەدان ساڵ ـ هەبووە ، بەڵام بەبێ ئەوەی چیرۆکنووس هەبووبێت جگە لە « یوهانی ئاهۆ » و ، « ماریا یۆتۆنی » کەرەنگە بە مامۆستای ئەم بابەتە ئەدەبە بژمێردرێت .

رەخنەگرانی ئەدەبی فەنلەندیو ئەو پسپۆرانەی خەریکی ئیدیۆمە هونەرییە باوەکانن بەشێوەیەکی گشتی پێناسێنێکی هەندێك تەسکیان بۆ کورتە چیرۆك داناوە کە بەزمانی فەنلەندی "novelli" پێدەوترێتو لە راستیدا لە ئیدیۆمەی "novella" ی ئیتالیاییەوە هەڵهێنجراوە ، ئەو ئیدیۆمەی کە بە زۆر جۆر لە زمانە جیاجیاکانی ئەورووپادا بەکارهێنراوە . ئیدیۆمەکە وای دەگەیاند کە چیرۆك گێڕانەوەی رووداوێکی نوێ یان کۆن بێت لەگەڵ پەسەندکردنی کۆتاییەکی سەیرو چاوەڕوان نەکراودا . "novella" زیاتریش وەکو نموونەیەکی زۆر چاك بژار کراو لە پەخشان دانراوەو، دەستی ئەو ئەدیبو خوێنەرە فەنلەندیانەشی پێنەدەگەیشت کە بناغەیەکی نەریتە ئەدەبییە باوەکانیان نەبووە . حیکایەتی کورتی نموونەیی لە راستیدا زیاتر لە جۆرەکانی تری ئەدەب لە ئەدەبی چیرۆکەوە نزیکە ، ئەوەندیش وردەکە نووسەرانو پسپۆرانو رەخنەگران لە فەنلەندە وەکو پێوانەیەك بۆ نرخی ئەدەبی بە ئەمانەتەوە بەکاریان هێناوە ، لەگەڵ ئەوەیشدا زانیویانە کە ژمارەیەکی زۆر لە پەخشانی کورت بەگشت جۆرەکان لەو سەردەمەدا لەگشت وڵاتەکاندا نووسراوە .

نووسەرە فەنلەندییەکان زیاتر لەچینە کۆمەڵایەتییە مام ناوەندییەکان بوونەو زیاتریش هەڵوێستیان لەبەرهەمەکانیاندا وادەردەکەوێت ساکاریو بەتەمایی تێکەڵاو بووبێت ، چونکە ئەوان رۆمان بەکارێکی هونەریی بەکەڵکی وا دادەنێن کە پێویستە ئێجگار بەبایەخەوە بنووسرێت ، بەڵام هەر خۆیشیان نووسینە پەخشانە کورتەکانیان وا لەقەڵەم دەدەن کە وێنەی وەسفی ئەدەبی یان حیکایەت بێتو بۆ کۆمەڵێك برادەر خوێندرابێتەوە ، زۆر جاریش وادەردەکەوێت رایان وابێت کە ئەم حیکایەتە ساکارانە زیاتر لە راستیی ژیانەوە نزیك بن وەك لەوەی چامەی بژارکراوی هونەری بنو ، زیاتریش بەهەستو چێژی راستگۆیانەوە رووی لە خەڵکی دەکەن بۆ زیاد لە پێویست خۆشویستنی جوانی .

« ماریۆ لاسیلا » کە نازناوی « ئەلگۆت ئیتاڤاینن ئەنتولا »یە ( ١٨٦٨ـ١٩١٨ ) لەم بارەوە باشترین نموونەیە ، باوکی وەرزێر بوو، بەرلەوەی لاسیلا بگاتە سیانزە ساڵان باوکی مردووەو ، بەر لەوەی ببێت بە مامۆستا خزمەتکاریی کردووە ، پاشان مامۆستایی قوتابخانەی سەرەتایی بووە ، ئینجا رۆژنامەنووسو نووسەر ، لەسەرەتای ژیانی ئەدەبییدا دوو رۆمانی گەورەی

# کورتە چیرۆك لە ئەدەبی ...

وەرگێڕانی: صلاح شوان

بڵاوکردۆتەوە ، بەڵام دوای ئەوە شێوەی نووسین و بابەتەکانی بەتەواوی گۆڕیوەو ، نازناوێکی بۆ خۆی داناوە کەلەوەو پاش پێی ناسراوە ، زیاتریش چیرۆکی کۆمیدییانەی دەربارەی لادێ نشینەکانی ناوچەکەی لەدایکبوونی نووسیوە ، خۆی دەربارەی شێوەنووسین و ئامانجەکانی دەنووسێت و پێی لەسەردادەگرێت کە : « من لەگەڵ ئەو رایەدا نیم کە کۆمەڵێك خەڵکی پەسەندکراو نووسینەکانم بخوێننەوەو ، هەرکەسەو پێویست بێت لە شەرواڵە تایبەتییەکەی خۆیدا بمێنێتەوە » یان « بەلای منەوە کارێکی گران نییە ئەو جۆرە حیکایەتە چڕکراوە کورتانەیان بۆ بنووسم کە پێویستە ، بەڵام خوێنەران لە حیکایەتی کورتی چڕکراوە تێناگەن . خەڵکی ئاسایی لەگەڵ ئەوەیشداکەم بایەخ بەم حیکایەتانە دەدەن بەڵام ئەم جۆرە نووسینانە هەر بۆ ئارەزوو دەخوێننەوە، نەك بۆ ئەوەی لەوێنە بەلاغییەکانی وردبینەوە ، بەلای ئەوانەوە شتی سەرەکی ئەوەیە ئەوەی دەیخوێننەوە بەئاسانی تێیبگەن » ، بۆیە لاناونیشانێکی وەهای بۆ یەکێك لەبەرهەمەکانی هەڵبژارد کە « شت » یان « نموونەیەك لەنووسین » بگەیەنێت .

« بنتی هانبا » ( ١٩٠٥ ــ ١٩٥٥ ) دەربارەی وردە وەرزێڕو دارفرۆش و ئاوارەکانی ناوچەکەی لەدایکبوونی خۆی کە باکووری فەنلەندەیە زۆری نووسیوەو ، پێی لێدادەگرێت کە نووسینە کورتەکانی ( حیکایەتی کورت ــ Novelli ) نین ، بەڵکو ( حیکایەت ) یان ( چیرۆك Juttu )ی لەو جۆرانەن کەکەسەکان خۆیان دەیانگێڕنەوە .

کارەکە لەلای « یوهانی ئاهۆ » دا ، ( ١٨٦١ ــ ١٩٢١ ) تارادەیەك بە جۆرێکی ترە ، چونکە ئەم بەلەدایکبوون سەر بەچینی ناوەندییە ، زۆر گەڕاوەو ، پیاوێکی بەناوبانگ و ، نووسەرێکی مەزنبوو ، خۆشەویستی و نیگەرانی خۆی دەربارەی هەژارو دەستکورتان دەربڕیوە ، بەڵام لە پایەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزەوە ، هەوڵیشی نەداوە بیروڕای خۆی دەربارەی کارە پەخشانە کورتەکانی بەتایبەتی ئاسان بەدەست و ڕووتێکراوبێت بەلای گشت خوێنەرانەوە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ، ئەو وای داناون کە ئەوان شایانی کۆششێکی هونەریی بەکەڵك نین ، دەربارەیان دەڵێت : « کاتێك کە دارتاش دەبێت بەهۆ ، کەپەکی دار دەڕژێتە سەر خاکی دارتاشخانەکەی ... من لێرەدا ئەم ( کەپەك ) ــە لەلایەن خۆمەوە بەتەواوی وەها پێشکەش دەکەم وەکو ئەوەی لە مێزەکەمەوە بەرەوە بووبێت و هەر یەکەریش بەردەکەم بەولاوە » .

بەڵام هەڵوێستی ئاهۆ لەلایەکی ترەوە هەندێك ئاڵۆزە ، چونکە هەندێك لە





« کەبەك »ـەکانی بە وردەکاریو وەســـتایانە دانراون ، بەتایبـــەتی ئەوەی لـــە « دیمەنێـکی زەینی » و « میزاجێکی غەمناكو بیروردانـە » دا دەردەکەوێت کە لەگشت نووسینەکانی تری زیاتر نموونەیین .

لەمەوبەر پێناسین دەربارەی کورتە چیرۆك لەلایەن نووسەرە فەنلەندییەکانی ترەوە دانراوە کە تائیستایش ، لەگەڵ پێداگرتن لەســەرشێوە ، هیچ ناوەرۆکێکی کۆمەڵایەتییان تیانییە .

« یۆل لهتۆنن » ( ١٨٧١ – ١٩٣٤ ) بەپلەی یەکـــەم وەکو رۆماننووس ناوی دەرکـــردووە ، لە پێشەکیی کۆمەڵە کورتە چیرۆکەکەیدا کـــە بەناونیشانی « چۆڵەوانیو بەهەشت »ـەوەیەو لە ساڵی ١٩٢٣ دا بڵاوبووەتەوە دەڵێت کـە « ئێمە لەدنیادا گشت شتێك بەگرانیو بەجۆرێکی تەواو جیـاواز لەوەی لەســـەری راهـاتووین تاقی دەکەینەوە ، زیاتریش شتێك نییە ناوی لێبنرێت حیکەی رۆمان » .

لە نووسەرە هاوچەرخەکانیش خاتو « ئیلا پنانن » کە لە ساڵی ١٩١٦ دا لەدایکبووە دەربارەی سوودی گێڕەرەوە لەکورتە چیرۆکدا لـە بـاری ســـەرنجی خۆیــەوە دەڵێت : « گێـڕەرەوە بە بەکارهێنانی کەسی یەکەم تەواو نائاشنایە ، یـان نارەســـەنو ناحەزو شازە لەنێوان گێڕەرەوەو پاڵەواندا ... وایش دەردەکەون شکاندنی ئـەو بناغە رەوشتییە بن کە پاش چیخۆفو مانـسفیلد باڵی بەســـــەر کورتە چیرۆکدا کێشاوە کە : نووســـەرو پاڵەوان دوو ئەندامن لـــە نەوەیەکی مرۆڤـایـەتییانە ، دوو هاوڕێو دوو دەســـتە خوشکن » هەر وەکو خاتو پنانن دەڵێت ، کاتێك کـە بەیەکجـاری گێڕەرەوە تووڕ هـەڵـدەدرێت کەسەکان لەرووی سۆزەوە دەبن بە بەشـــێك لە نووسەر .

« ڤیۆمری » کە یەکێـکە لـــە دیـارتـرین نووســـەرەکانی دوای جەنگ ، هەڵوێســـتێکی دوژمنکاریی بەرامبەر یاسا باوەکانی شێوەی کورتە چیرۆك هەبووە ، دەربارەی نووسینەکانی خـۆی دەڵێت : « هەر کورتە چیرۆکێك ژمـارەیەکی تر دەخاتـە ســـەر ئەو شـــێوە ئەدەبییانەی کـە دەرنەکەوتوونو سەر بنچینە ناکۆکەکان ، هـــەر کورتە چیرۆکێکیش هـــەوڵێکی نوێیەو کـارێکی گەورەی هەیە دەمـــەوێ بـە هۆیـــەوە چۆنێتی هەڵوەشاندنەوەی بچەســـپێنم ، کە چۆن ئـەم کورتە چیرۆکـە ، هـەروەهـا ، گشت مەزەندەو مەرجە تایبەتییەکانی خـۆی ســـەرنگوونو بۆش دەکات » .

کورتە چیرۆکی فەنلەندی لەرووی ناوەڕۆکەوە سەر بەشـــێوەی گشتی ئەدەبی فەنلەندییەو ، ماوەیەکی زۆر نییەو تائیستایش زیاتر باسی ئـاو لەلادێو ، هەژاریو ژان زیاتر لەباسی بەختیاریو خۆشگوزەرانی دەکـات . ژمـــارەیەکی زۆریش لەکورتە چیرۆکی کۆمیدی نووســـیوە ، بـەڵام گاڵتەجاڕییەکەی زیاتر ئامانجێکی سوود بەخشـی هەبووە . ئێـــــــستایش نارەزایی دەربڕینێکی گاڵتەجاڕیو یاخی بووانەیە دژی گشــت جۆرە چەوســـاندنەوەیەك لەجیهاندا ، هـــەر وەکـــو لە چیرۆکەکانی هانبادا وەهایە ، یان شـــێوەیەکی ئێجگار کارامانە بۆ لە دەستدانی دارایی و هێــز ، وەك لەلای لهتۆننو هانبایش ، یان تانەگرتنە لایەنە بێهێزییەکان لەرەوشـــــتی مرۆڤدا ، وەك لەلای ماریاپۆتۆنی ( ١٨٨٠ – ١٩٣٤ ) ، یانیش گەپێکی خۆڕســـك لەرۆح سووکییەکی پڕ ئاژاوەدا دژی گشـــت ئەو بێئەقلییانەی لە دنیادا دەکرێن ، وەکو لەلای ڤیکۆ هۆڤینن کە لە ساڵی ١٩٢٧ دا لـەدایکبـــووە ، یـانیش دەبێت بـەهـەوڵێـکی نائومێدانەو ناســـــەرکەوتوو لەکۆتاییـــدا بۆ دەستخستنی شتێکی بەســـوودو چاك لـەنـاو ناهەمواریی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا هەروەکو لەلای ســــــیلانپا ( ١٨٨٨ – ١٩٦٤ ) ، یـانیش دووپاتکردنەوەی ونبوونو بێهوودەیی گشـــتی ، وەك لەلای مری .

لە قۆناغی سەرەتاوا کورتە چیرۆك زیـــاتر وەسفیبوو . لە ( ناوی ئافرەتێك )و لە ( کەرتـە نـانێـك ) وا پاڵەوانەکـــە خۆی وادێتەبەرچـاو لە شەمەندەفەرێکدا سەفەر دەکاتو ســـەرنجی هاوڕێکاکەی تەکی دەداتو هەوڵدەدات بەمەزەندە بـزانێت ژیـانی چۆنـەو ، هـەردوکیان دەکـات بـەپیرەمێرد تاوابان لێبێت لـەکـاریکی هونەریی تەواوکراو بچن ، هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نایەت، لەبەر ئەوەیش رەنگ بێت ،لەسەرخۆ ســـەرنجی بدات .

لە ( ناوی پیاوێک )دا وێنەیەکی وەسفیی

گاڵتـەجـاڕیی زۆر دڵـگیر هـەیـە ، پاڵـەوانـە ســـەرەکییەکە کاردەکاتو دەدوێت ، بەڵام هیچ شتێکی گرنگ رووناداتو هیچ بەرەســـەندنێك

نییه ، پاڵەوانەکە وەکو شـــــارەزایەکی بەتوانا دەردەکەوێت کە حەز لـە گەرماوی ســــاونای فەنلەندی دەکـات . بەڵام چیرۆکـــەکانی ماریـا پۆلۆنی لـە چیرۆکـــەکانی ئـاهــۆ بەدرامییانـەتر دادەنرێن ، لەبەرئەوەی بەراســتیش پاڵەوانیان تیایە دەدوێن‌و کاردەکەن ( نامەنووسین لەراستیدا قسە کردنیشە ) بەڵام لـە چوارچێوەی چیرۆکدا زۆر جـار وایـە کردارەکـە لەرابوردوودا رووی داوەو پاڵەوانە سەرەکییەکە لەدیالۆگێکی درێژدا دەیگێڕێتەوەو تەنها ئەم ســـەرنجانە دەبیڕێت : «تۆ نەتـوت» یان «بەڵێ وایە» یان «بەردەوام بە» کە گوێگرەکە دەیلێت ، ئەم نووســــــەرە زۆر شــــــارەزایە لەوەی وا لەخوێنەر بکات ئـەو خۆپەرستییە تێبگەن کە پاڵەوانەکان لەژێر سۆزە دارژاوەکانیاندا دەیشارنەوە ، بەڵام زیاتریش هەر لەم پلە سەرەتاییەی توانج تێگرتندا راناوەستێت ، ئافرەتەکانی ، ئەوانەی خۆیان بەپیاوان دەفرۆشن بۆ ئەوەی جێگای ژنی شەرعی یان کەیبانۆیەتییان دەســــتبکەوێت ، باوەڕیـان بەخۆیان نەبووەو وادەزانن دوانیان دەربارەی دڵداری ، پیاوان هەر بەواتا رووکەشەکەی وەری دەگرن ، زۆریشــیان بەلاوە ســــەیرە و ، ئەو پیاوانەی خۆیان بـەو ئافرەتانەوە دەبەســـتنەوە کە تەنها درامـەتێکی مادییان مەبەســـتەو هیچیتر بەگێـل دەزانن‌و ، لەگەڵ ئەوەیشدا حەزدەکەن پێیان بوترێ بەهۆی دڵدارییەوە تووشی گیرمەوکێشە هاتوون .

کورتـــە چیرۆکـــەکـانی « ڤۆلتەر کیلپی » ( ١٨٧٤ – ١٩٣٩ ) و « هێکی تۆپیللا » ( ١٨٨٥ – ١٩٦٣ ) هەڵوێستێکی دوورە پەرێزیان لەگشــت هاوکارەکانیان گرتووە لە ئەدەبی فەنلەندیدا بگـرە تاڵەگشت ئەدەبی جیهانیش . هەردوکیان چاویان بڕیوەتە رابوردوو هەردوکیانیش زیاتر هەر وێنەی پاڵەوانی بەتەمەن دەکێشن ، کە هەندێکیان لـــە چیرۆکەکەدا دەمرن ، زیاتریش ئەو پاڵەوانانەیان بە مەنەلۆگی ناوەوە یان بە بەدوانی پچڕپچڕ وردو درشتی ژیانی رۆژانەی خۆیان دەکێشنەوە تاوەکـو وێنەکانیان لە زەیندا تەواودەبێت ، هەروەهـــا هەردوکیانیش شێوە زمانەکەیان کاری تێکردوون .. تۆپیللا لە باکووری رۆژئاواو کیلپی لە باشووری رۆژئاوا – بەڵام تۆپیللایان بەبێ هیچ دەســـــت پێوەگـرتنێـــك فۆلکلۆر بەکــاردەهێنێت‌و ، چیرۆکەکانی تێکرا حیکایەتی میللین‌و بۆ لەچاپدان ئامادەن .

خۆی دەدات بەدەستەوەو سەر بۆ کردەی خـودا شۆڕدەکات . ئەوکیلپییەی کەلەو نووســـینەی رەخنەییانەیەوە تە لە ســـــەرەتای ئەم چەرخەدا بڵاوی کردنەوە تێورێکی ئیســـتاتیکیی بۆ ژیـــان هەڵهێنجا ، کۆن پارێزبوو ، هەرگیز رەخنــــەی

تۆپیللا دەربارەی خێوو جنۆکە نانووسێت ، بەڵکو بەپێچەوانـــەوە ، دەربارەی ژیانی خـەڵـکی ئاسایی‌و ژیانی رۆژانەیان دەنووســـێت ، ئەمیش وەکو کیلپی ، رۆمانیشی نووسیوە ، بەڵام شێوەی نووسینی زیاتر بۆکورتە رۆمان دەست دەدات ، لـەبـەر ئەوەی دووبارە بوونـەی دەقی درێـژی تیـانییە .

بـەڵام دەربارەی کیلپی ناتوانرێت بوتـرێت شێوەی نووسینی بۆشتێکی تایبەتی دەســــت دەدات ، جگە لەوەی بۆ بەرهـەمی ڤۆلتەر کیلپی خۆی دەســـت دەدات ، کارە هەرە مەزنەکـەی لەنووسینی ئەو رۆمانەدابوو کە ناوی « لە ژوورە سەرەکییەکەی کێلگەی ئەلەستالۆدا » وە بوو ، کـە دەربارەی گفتوگۆی دوورو درێـژە لـەنێوان دەوڵـــەمـــەندو ، خاوەن کەشـــتییەکـانو ، کاپتنەکاندا . کورتە چیرۆکەکانیشی لەو کۆمەڵـە چیرۆکەدا بڵاوکردەوە کە ناوی « گەلێکی بچـووك لـەم هەرێمەدا »ی لێنراوە ، ئەمیـــان وەکـــو رۆمانەکـەی نییـەو ، ئەوەندەی بـاسی هـەژارو ژێردەستان دەکات ، کە کارکردنیان بۆ سـەرکەوتنی دەوڵەمەندان پێویســــــتە ، بەڵام هیچ جۆرە کێشەیەکی کۆمەڵایەتیی تیـا نییە ، چونکە کیلپی خاوەندی بیرێکی کۆنپارێزە ، ئـەو چیرۆکانـەی تەنهـا شـکردنـەوەی نوشـتیە تـایبەتییەکـانی پاڵەوانەکانێتی ، کەچی رۆمانەکەی باســـکردنی ســــەرکەوتنی تاکە کەســـــە . دوو چیرۆکی « تەنگوچەڵەمەی کەشتییەوانێك »و « بەســـەر بەفردا رۆیشتن » زیاتر بریتین لەمەنەلۆگی ناوەوە کە بەهۆیەوە پاڵەوانەکان سـەرگوزشـــتەی ژیانی رۆژانەی خۆیان دەگێڕنەوەو ، بەدوورو درێـژی باسی رووداوەکانی رابوردوو و دەقی گۆڕانییەکەو بیرو هەستی خۆیان دەکەن لە « بەسەر بەفردا رۆیشتن »دا زەلامێکە ژیانی خۆیو خێزانەکەی بەهۆی لەخۆبایی‌بوون‌و کەللەرەقییەوە تێکدەدات لەگـەڵ ئەوەیشدا کـە دەزانێت ئەم ... ناپەسەندە ، نیتر تامردن هەر ...

بۆ ئەم هەڵوێستە دەمارکرژانەیەك خۆی بکات . له « تەنگوچەڵەمەی کەشتییەوانێك »دا پیرێژنێکی هەژار هەوڵدەدات هۆی ئەو هەموو ئەندێشەیە بدۆزێتەوە کە تووشی دێتو کە دەڵێیت سزایەکە بەسەریدا دراوە ، هەندێك جاریش لە ویستی خودا یاخی دەبێت بۆ رزگارکردنو بەرگری کردن لە دادو بەویژدانییەزدان ، بەڵام پاشان

نەلەکلیساو نەئایینیشی بەشێوەیەکی لەرووانە نەگرت ، بەڵام وایش دیارە لەباوەڕی مەسیحیدا هیچی وەهای نەدۆزییەوە فەرامۆشیی پێی بێت .

ئەوانە وێنەی نموونەیین بۆ شێوەی نووسینی کیلپی لەو بەرهەمانەی ئەم دواییەیدا کە مۆرکی تاکە کەسییانەی ئائەوپەڕەکەی پێوەدیارە ، لەکاتێکدا کەهەوڵی گەیشتن بە لوتکەی تەواویی هونەری دەدات . بەپێی ئەو پاڵەوانانەی باسیشیان دەکات هەوڵیداوە زمانی سەرجادە بەکار بهێنێت .

ئەو وێنە نرخشناسیو خواستانەی بەکاریشیان دەهێنێت لە دەوروبەری ئاشنای پاڵەوانەکانییەوە خواستوونی وەکو دەریاو دەریاوانیو ئاژەڵە دەستەمۆکان . بەڵام ئەم کەرەستانە وەها بەکاردەهێنێت کەبیری وردەکاریانە دەربارەی دنیاکەیان کە دنیا تایبەتییەکەی خۆیشێتی لەژیانیدا دروست بکات. هەندێك پێیان وتووە کەهەندێك لێکچوون لەنێوان ئەمو پرۆستدا هەیە جا لەبەرئەوەی فەرەنسایی زانیوەو شتێکیشی لە « گەڕان بەدوای کاتە ونبووەکەدا Ala Recherche du Temps Perdu خوێندووەتەوە ، خۆیشی دانی بەوەدا ناوە کە شێوە نووسینی پرۆستو شێوە نووسینی ئەم زۆر شتیان لەنێواندا هاوبەشە ، بەڵام لەئامانجدا بەتەواوی لەیەك جودان . پرۆست هەمیشە راستگۆیانە لەسنووری بەکارهێنانی زمانی بەرێژیمدا وەستاوە ، بەڵام کیلپی لەگەڵیدا ناکۆك بووەو ، ئەو هێزە فیکریو وێنە نرخشناسییانەی کە لەناو رۆمانەکەیدا کۆك چنراون ، هەر ئەوانەن بایەخی شتە هەستت پێکراوەکانی واڵێدەکەن لە دنیاکەیدا سەرنج رابکێشن وەکو بریقانەوەو دارژانەکانی سەردەمە مرۆڤایەتییەکان و ، رەتبوونی بەپەساوەی لە ئیستاوە بۆ رابوردوو و ، لە ریالیزمیەوە بۆ خەیاڵیو کرداریو ، لەمەنەلۆگی ناوەوەوە بۆ چیرۆکی بە ئامانج . گشت ئەمانەوا لە خوێنەر دەکەن « کلۆد سیمۆن »ی بێتەوە بیر بۆ نموونە لە « رێگاکەی فلەندەر ـ La Route Flandres دا . نووسەرە فەنلەندییەکان بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ زۆریان دەربارەی ژیانو خەڵکی لادێ نشینەکان نووسی ، ئەویش بەشێوەیەکی ساکارو ، بەبێ پەیڕەوکردنی بەرنامەیەکی پێشەکی چەسپاو یان ئایدیۆلۆژیایەکی دەستنیشانکراو ، لە چارەسەرکردنی تاکە کەسیانەیشدا لەوبابەتانەی هەڵیان دەبژارد داهێنەربوون .

« پنتی هانپا » بەتەواوی لەتۆپیللاو کیلپی لەهەر نووسەرێکی تری فەنلەندی جودا ، رەنگە هەندێك لێکچوونی لەگەڵ فیۆمریدا هەبێت . سەرگوزشتەی رووداوەکان لەکتێبەکانی هانپادا لەفەنلەندەی نوێدا روودەدەن ، واتە لەساڵانی بیستدا ، باسی یاسای قەدەغەکردن ( کە لەهەمان ماوەدا لە وڵاتە یەکگرتووەکانیش سەپێنراوەو هەمان ئەنجامیشی هەبووە )و هەروەها باسی ستییە گەورەکەی ئابووریو ، جەنگو ، ماوەی دوای جەنگ دەکات ، گشت ئەوانە بەشێوەیەکی راستگۆیانە لەبەرهەمەکانیدا رەنگیان داوەتەوەو کاریان کردۆتە سەر ژیانی پاڵەوانەکانی ، کە هەر خەڵکە فەنلەندییە ئاساییەکان ، ئەوانەی بەتەواوی لەبیرو باوەڕە خەرافییەکان رزگار بوونەو ، کە رەخنەکانیان بەبێ زمان پاراستن دەدەن بەدووی جیهاندا ، بەرخنەگرتن لە سەرمایەداریو جاروبار لەسۆشیالیستیش . لەساڵی ١٩٢٨ دا هانپا کۆمەڵە چیرۆکێکی بە ناونیشانی « گێڵگەو سەربازگاکان » بڵاوکردەوە تیایدا بەتوندو تیژی رەخنە لەوە دەگرێت کە ناوی « دڕندەیی » و « دەبەنگی »ی لێدەنێتو کە خووی گشت سوپایەکی داگیرکەرن لەجیهاندا ، بەڵام ئەم رەخنەیەی بەناڕەزاییەکی توند بەرەنگاری کرا ، چونکە فەنلەندە بەزەحمەت توانی بۆ ماوەی دەساڵ سەربەخۆیی لەو ماوەیەدا بپارێزێتو بەجەنگێکی ناوخۆیشدا تێپەڕی . زوربەی هەرەزۆری بڵاوکەرەکان بۆماوەی زیاتر لە دەساڵ رازی نەدەبوون کتێبەکانی بڵاو بکەنەوە . بۆیە زوربەیان دوای مردنی بڵاوکرانەوەو واسی ساڵێکیش دەبێت رێزی لێنراو مەڵبەندە ئەدەبییەکەی پێدرایەوە . هانپا دەربارەی خەڵکی ناوچەکەی خۆی زۆری نووسی . چونکە زۆربەی

ژیانی هەر لەوێدا بەسەربرد . لە ژیانیشـــیدا هەندێك قسـەو مسـەی لەســـەر بلاوبووەوە . وادەزانرا هانبـا یەکێـك بێت لــەو دارفرۆش و ئاوارانەی کـە خۆی بەدوورو درێژی باســـیانی کردووەو وایش دەزانرا هـــەر تەنها دەربــارەی تاقیکردنەوەکانی خۆی بەم شێوە . یان ئەوی تر دەتوانێت بنووســــێت بــاوکی وەرزێرێکی دەســـترۆبوو . لەگەڵ ئەوەیشـــدا ئەم خۆی لە خوێندنی سەرەتایی زیاتری تەواو نەکرد . بەلام زۆری خوێندەوەو لە رێگای خۆ فێرکردنەوە زمانی ئینگلیزیش فێربوو . لە کتێبخانەکەیدا ژمارەیەکی زۆر کتێبی بـە زمـــانی ئینگلیزی هەبوو . کــە بۆ نموونە بەرهەمەکـــانی « جێمس جۆیس »یشی تیابوو.تەنانەت دوو چیرۆکیش وەکو دوو چیرۆکی کۆمەڵە چیرۆکەکەی جێمس جۆیس دارشتووەکە نـاوی « خەڵکی دبلن »ی لێنـــراوە . رەنگەبێت ویستووبێتی رەخنەگرانی ئەدەب تـاقی بکاتەوەو بزانێت دەتوانن گزی بکرن . بەلام دوای چەنـــد سالێك پاش مردنی نەبێت نەیانزانی !؟!

هانبا باسکی کەسانی سەرنج راکێش و بزێو لەکورتە چیرۆکەکانیدا دەکات ، لەگەڵ ئەوەیشدا کـە چیرۆکەکانی بەوە نەناسراون کـــە گێرانەوە حیکەیان بێت و لەو رێگایـەوە بگاتە کۆتـــایی ، بەڵکو پێشکەش کردنی وەسفێکی وردی کەسێکن لـە پلەیـەکی کۆمەلایەتی و دەوروبەرێکی دیاردا . پاڵەوانەکانی تەنها ســــەرگوزشتەی گێرەوەن بەشـێوە نووسینێکی ئاســان وورد ، بەبێ هیچ رازاندنەوەیەکی شێوە ، مەنەلۆگی ناوەوەیشـــی بەکــــار نەهێناوەو زۆر کەمیش باســـی بیروڕای پاڵەوانەکانی دەکات . لەم چیرۆکانەیدا کە باسی ئارو کردەوەی خەڵکی ئاسایی دەکات هەنـدێك لێکچوونیان لەگەڵ گۆرانییە میللییە سەماســـازە ئەمریکاییەکاندا هەیە . پاڵەوانەکانی هانبا لەلادێی سـەخت و چۆڵی باکووری ئەنلەندەدا دەژێن و دژی ئەو جیاوازییان تێدەکۆشن کــە لەو ناوچانــەدا بلاوبوونەتەوە ، بەبێ ئەوەی سەرکەوتنێکی تەواو وەدەست بهێنن و بەبێ ئەوەی خۆیشـــیان بدەن بەدەستەوە . پاڵەوانەکانی شــــۆخی کردن و گاڵتەجاری و ، مەی خواردنەوەوە بەکار دەهێنن و رەنجێکی بەفیرۆ دەدەن بۆ رزگاربوون لــە ئەرکی کاری رۆژانەی ســـەخت ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت . بەرهەمەکانی هانبـــا بەنارەزایی دەربڕین دەژمێردرێن لەرووی رێژیمە کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسییەکاندا . بەلام بەشـــێوەیەکی هێجگار دەگمەن نارەزاییەکانی دادەرێژێت . ئەم نووســـەرە . بەبێ هیچ گومانێك ، هەولــادات بەزەیی و ســــۆز بۆ پاڵەوانەکانی بورووژێنێت ، چونکە وەکو کەسانی بەهێزو رەوشت سەربەخۆ باسیان دەکات و پشت بەخۆیان نەبێت بەکەس تر نابەستن . تەنانەت وایش دەردەخات کە یارمەتی هیچ سوودێکی نییە ، چونکە گاڵتەجارییەکەی لە کۆتاییدا وادەردەکەوێت دژی ئەو جیهانە بێت کە بە جۆرێکی پڕ مەترسی دەگۆرێت و ، مرۆڤ تیایدا زیاتر هەر ئازار دەکێشـــێت و رەنجی بە فیرۆ دەدات .

« ف. ئە. سلانپا » پاداشتی نۆبلی یەکـەم پلەی لەسەر رۆمانی ( سیلیای کارەکەر ) پێدرا ، ئەم رۆمانەی ئەو دوای بەرهـەمـە ئەدەبییەکەی داپۆشی بەتایبەتیش لەدەرەوەی فەنلەندەدا ، بۆیە کورتە چیرۆکەکانی لەدەرەوە نەناسراون .

لەســـەرەتای ژیانی ئەدەبییدا دوو رۆمانی کورتی بەر لەســـالی ١٩٢٠ بلاوکردەوە ، بەلام دوای ئەو ســـالە تەنها هــــەر کورتە چیرۆکی نووسیوە . جا لەبەر ئەوەی نووســــەرە لاوێکی بەهرەداربوو ، هەموان وای بۆ دەچوون لەســـەر رۆمانووســــین بەردەوام بێت ، بەلام خۆی رای وابوو نووسەر ناگاتە پلەی نووسەرێکی بەراســتی مەزن تەنها بەنووسینی رۆمانێکی مەزن نەبێت ، بۆیە لە سالی ١٩٣١ دا ( ســیلیای کارەکەر )ی نووسی .

بە راستی کارێکی بەتامە رۆمانەکەی لەگەڵ کورتە چیرۆکی (ئاهەنگێکی سەماسازی لەشەوێکی نیساندا ) ناونراو کە لە کۆمەڵە چیرۆکی ( گردو کەپرەکە ) لە ســال ١٩٢٥ دا بلاوکراوەتەوە ، دەتوانین لێرەدا بڵێین ئەو رووداوەی لە کورتـــە چیرۆکەکە باسکراوە وێنەیەکی تەواوی پاڵەوانـــە سەرەکییەکە دەدات بەدەستەوە ، بەلام رۆمانەکە هەر تەنها رووداوی لابەلا دەخاتەسەر پاڵەوانەکەی بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی نوێ لــە رووی کاکڵەوە بدات بەدەستەوە .

لەکورتە چیرۆکەکەدا ســـیلیا کە پاڵەوانی سـەرەکییە . لەبەر ئەوەی ئەوەنـدە داوێن پـاك و چاکە تەنانەت هەر پێویســـتیشی بەوە نییە ئـەو قسە هەڵبەستراوە ناپاکەی کار دەکاتە ســـەر ئابڕووی بەدرۆ بخاتەوە ، بۆیە دەزگیرانەکـــەی

لەدەست دەدات ، بەڵام دەزگیرانە لاوەکەی لەگەڵ ئەوەیشدا باوەڕبەو قسە هەڵبەستراوە دەکات ، رۆمانەکە سەرگوزشتەی باوکی کچەکەیش دەخاتە سەر ئەو بەسەرهاتە ، کە ئەویش پیاوێکی داوێن پاکو چاك بووە ، وەکو کچەکەی ، سەرەڕای ئەوەی پیاوێکی سەرکەوتوویش بووە لەدنیادا ، کچەکە دۆستایەتییەکی رۆمانسیبانەی لەگەڵ پیاوێکی گەنجدا لەشارەکەدا هەبووە ، بەگەنجیش بەنەخۆشیی سیل دەمرێت . گشت رەخنەگرە فەنلەندییەکان رایان وابوو کەسەرگوزەشتەی باوکەکە یەکێتیی رۆمانەکە دەرووخێنێت ، چونکە دوو پاڵەوانی سەرەکیی تیا دەبێت .

چیرۆکەکانی سلانپا تارادەیەك لەچیرۆکەکانی هانپا دەچێت ، چونکە پاڵەوانەکان ـ هەر بۆ نموونە ـ لەرێگای کردارو قسەکانیانەوە لە جێگا ئاساییە ئاشناکانی خۆیاندا پێشکەش دەکرێن ، بەڵام دارشتنەکەی سلانپا زیاتر چڕە . سلانپا هەندێك جار مەنەلۆگی ناوەوە بەکار دەهێنێت ، کە هەر لەخۆوە تێکەڵ بە چیرۆکەکە دەبێتو بەئامانجە لەچاو دراوەکەوە دەلکێتو ، هەر خۆیشی لێدوانی راستەخۆو ئەنجامی فەلسەفییانە دەربارەی بەرهەمەکەی پێشکەش دەکاتو بەکەسەریش ئاراستەی خوێنەری دەکات .

پاڵەوانەکانی ئەم نووسەرە لە پاڵەوانەکانی هانپا تەمبەڵترو سەلبیترن ، هەر وایش هاتوونەتە کایەوە تا ئازار بچێژنو خۆیان بدەن بە دەستەوە ، نووسەر هەوڵ دەدات راستبوونی

کارەکەیان بەپێی بۆچوونی خۆیان پیشان بدات ، چونکە پیاوان ـ بەپێی فەلسەفەکەی ئەو ـ کاتێك کە دوای غەریزەکانیان دەکەون بەختیارتر دەبن ، نەك بەپێی ئەوەی ئەقڵیان رێیان بۆ دەکێشێت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا سلانپا هەستی بەوە کردووە کە هەر تەنها ئەشکەنجە کێشان بەختیاری بۆ خەڵکی ئاسایی ناهێنێت ، جۆرە بەزەیەکی بەحاڵی پڕ کارەساتیشیاندا دەێتەوە ، ئەگەر چیش ئەم بەزەیی پیا هاتنەوەیە جۆرە تووڕەییەکیشی تێکەڵاوە لەبەر ئەوە دەستەڵاتی تێکۆشانیان نییە بۆ بەرگری کردن لە خۆیان . تاوەکو گاڵتەجارییەکانیشی جۆرە هەوڵێکی نائومێدانەیە دەیەوێت بەهۆیەوە دووپاتی بکاتەوەو بەخۆیو بەخوێنەرانیشی بڵێت کە پاڵەوانەکانی ئەوەندە گێلو بێتوانان تاوایان لیهاتووە بەباشی شۆخیو نوکتەبازی بەو هۆیەوە بزانن ، هەروەکو بۆ نموونە لە رۆمانی "Hurska Kurjuns" یدا .

ئەوەی نوێی نووسەران کە لەدەوروو بەری ساڵی ١٩٥٠ دا سەریان هەڵداو شێوەیەکی نوێیان لە ئەدەبی فەنلەندیدا پێشکەش کرد کورتە چیرۆکنووسی نموونەییان تیانییە . هەر بەرێکەوتیش وەکو نوێخواز سەریان هەڵدا ، چونکە کۆمەڵەیەکی پێکەوە بەستراویان لە رووی دیالەکتیکییەوە پێك نەهێناو ، هیچ بەیاننامەیەکی رەسمیشیان دەربارەی ئامانجەکانیان بڵاونەکردەوەو ، دەستیشیان نەدایە گۆڕینی ئەدەبو جیهانیش .

لەنێوان ئەو نووسەرانەی کە بەر لە ساڵانی پەنجا بەرهەمیان بڵاوکردووەتەوە دەبینین بەشێکی کەمیان چالاکانە لەنووسین بەردەوام بوونەو بەرهەمی شیاویان بە دنیای ئەمڕۆ پێشکەش کردووە . خاتو ئیلاپینان یەکێکە لەمانە ، لەکارە سەرەتاییەکانیدا لەنێوان هونەریو ریالیزمییانەدا جۆرە دژواریو ناکۆکییەك هەیەو ، تا ئیستایش بە ئاشکرا بایەخ بەبارە دەگمەنو پاڵەوانەکان دەدات وەك لەودوو رۆمانە مێژوویە بەنرخەیدا کە لە ساڵانی ١٩٥٤ تا ١٩٥٨ دا نووسیویانییە ، بەڵام ئەم لەو کاتەدا بەبێ دوو دڵی بەرەو دنیاو پاڵەوانی هاوچەرخانە دەچوو ، تەکنیکەکانی لە باوەکان بوونو ، هەوڵیشی نادا سەرنجێکی نوێ دەربارەی دنیا بە بەکارهێنانی شێوەیەکی تارادەیەك سەربەخۆ بهێنێتەکایەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا تارادەیەکی دوور شناسنامەی تایبەتیی خۆی هەیە ، لەو کورتە چیرۆکانەیدا کە لە هەردوو کۆمەڵە چیرۆکی ( ساختمانێکی ئێجگار بەرز ) ساڵی ١٩٥٢ و ( دوان ) ساڵی ١٩٦١ و هەروەهایش لە دوا رۆمانیدا باسی خەڵکی ئاسایی دەکات لە هەڵسوکەوتی رۆژانەیاندا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم هەڵسوکەوتانە زۆرجار کێشەو کرژبوونەوەو ناگونجانی لێدەبێتەوە ، جاروبار مەنەلۆگی ناوەوە بەکاردەهێنێت کە بیروڕای ئەو پاڵەوانانە لە رووی زەینەوە پێکەوە دەبەستێتەوە، یانیش لە رێگای قسەوکردارە تایبەتییەکانیانەوە پێشکەشیان دەکات ، پاڵەوانەکانی دوور لە بەرچاوی خەڵکی دەژینو قسەو سەرنجی راستەوخۆو ناراستەوخۆ نەدەربارەی پاڵەوانەکانو نەدەربارەی هیچ مەسەلەیەکی تایبەتی کە پەیوەندیی بەسیاسەت یان مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەبێتو نەدەربارەی رەفتارێکی

ڕەوشتانە دەرنابڕن ، ئەوەی ئەوان زۆر بایەخی پێدەدەن ئەو بارانەیەکە کە تیایدا کێشە لەنێوان دوو پاڵەواندا یان لە نێوان پاڵەوانێك کۆمەڵەیەکی خاوەند هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتی یان لە نێوان ئەوو خووورەوشتە کۆمەڵایەتییەکاندا لە ڕێگای گوناهێکەوە کە نازانرێت کێ کردوویەتی بەرپا دەبێت . ئەم کێشانە هەرگیز درامی نین‌و هەرگیزیش شێوەی توندوتیژ ناگرن‌و هەرگیزیش چارە بۆ ئەو گیروگرفتە نادۆزێتەوە کە دێنەکایەوە ئەوەی ئەم نووسەرە بەلایەوە مەبەستە ئەوەیە چۆن ئەم پاڵەوانانە دوچاری ئەم بارانە دەبن‌و بە چ جۆرێك ڕووبەرووی ڕەفتار دەکەن . وایش دەردەکەوێت ئەم نووسەرە هەمیشە گیرماوە لە نێوان ڕەخنەگرتنێکی مام ناوەندی‌و کارەساتە سووك کراوەکانداو ئەوەیش لەسەر ئەو دیمەنی ناکۆکییەی نێوان ئامانجە جۆر بە جۆرەکاندا راوەستاوە کە پاڵەوانەکانی دەیان خەنە ڕوو و هۆیە هەست پێنەکراوەکانیان وەکو خراپ لێك تێگەیشتنێکی تارادەیەك سەیر یان لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوەکانیان بەراستی سەلبین .

لەنێوان نووسەرانی ساڵانی پەنجادا لەوانەی ئێستا بوونە بە کلاسیکییە لاوەکان فیۆمرییە ، کە یەکێکە لە باشترین نووسەرە ناودارەکان‌و ، بەلای ژمارەیەکی زۆری خوێنەران‌و ڕەخنەگرانیشەوە وەکو یەك پەسەندو خۆشەویستە . لە بەرهەمی مریدا دوو ڕاستیی ئاشکرا سەرهەڵدەدەن : بابەخدانی بەژیانی سەربازیانەو جەنگ‌و ، بەوەی کە بەبێ وردبوونەوە ناوی ( ناماقوولانە )(١)ی ئەو جیهانەی لێنراوە کە باسی دەکات . بێهوودەیی‌و ناماقوول لەم دواییەدا زۆر باس‌دەکرێن‌و زیاتریش هەر خراپ بەکارهێنراون . پێویستیشە بوترێت کارەکانی مری لەکاکڵەدا ڕیالیزمین‌و لەگەڵ بەرهەمەکانی ئیۆنسکۆو پنتەروبیکیتدا نە لەرووی شێوەو نەیش لە ناوەڕۆکدا بەراوردناکرین .

پاڵەوانەکانی مری لە فەنلەندەی نوێدا یان لە ڕابوردوویەکی زۆر دووردادا دەژین‌و سەرگەرمی هەڵسوکەوتی ئاسایی ڕۆژانەن ، یان لەکێشەدان لەگەڵ سروشتدا . زوربەی چیرۆکەکانیشی یان دەربارەی جەنگن ، یان دەربارەی ژیانی سەربازین . بەهەرحاڵ ، بەپێی ئەوەی مری خۆی دەربارەی ڕیالیزمییانە لە ڕۆمانی نوێدا وتوویە ناتوانین بڵێین ئەم ڕیالیزمییە . لەو وتارەیدا مری گفتوگۆ لەگەڵ گشت نەیارەکانیدا بەبێ ئەوەی ناویان بهێنێت ، دەربارەی ڕۆمانی نوێ گفتوگۆ دەکات ، ئەوانەی وەکو خۆی دەڵێت ئەو خراپەیەی دەدەنەپاڵ گوایە بەرهەمەکانی پڕن لە وردە سەرنجی وەها کە پەیوەندییان بەبابەتەکەوە نییەو وەك پێویستە وەها بایەخ بەراستییە بنەڕەتەکانی ژیان نادات . مری دەڵێت ڕیالیزمییەکانی سەدەی نۆزدە لە نووسەرانی ڕۆمانی نوێ جیاوزن ، چونکە ئەوان هەر تەنها ئەو شتانەیان خستووەتە ڕووی کە پەیوەندیی تەواویان لەگەڵ بابەتەکەدا هەیە ، بەڵام مری پێی لەسەر دادەگرێت کە ئەو نووسەرانە ( بەلزاك ، تۆلستۆی‌و ئەوانی‌تر ) هەرگیزاو هەرگیز ڕیالیزمی نین ، چونکە دنیاکانیان داهێنراوی دەستی خەیاڵیانەو هەرگیزاو هەرگیز چاومان بەوجۆرە دنیایە ناکەوێت . بەپێی‌ڕای مری ڕۆمانە نوێیەکان لە شاکارە کلاسییەکان ڕیالیزمی‌ترن ، چونکە ئەمانە شتی وردی پەیوەندنەدارو نەدار بە بابەتەکەوە دەربارەی ژیان بەکاردەهێنن ، بەڵام نەیارەکانی دەتوانن بەوبیانووە وەڵامی بدەنەوەکە دەردی سەرەکیی ڕۆمانی نوێ لەو خاڵەدایە ، ڕیالیزمییانەیەو بەس ، بەرهەمێکی پڕوردەکارییە دەربارەی شتی پڕوپووچ .

دەربارەی شێوەی کورتە چیرۆك ، مری دەڵێت : « بە شێوەیەکی گشتی نووسەرە فەنلەندییەکان ڕازی نەبوونە بەرهەمە بڵاوکراوە کورتەکان بخەنە ژێر ڕکێفی هیچ جۆرە دارشتنێکە وە بۆیە جۆرەها ناویان لێناوەو خۆیان لە بەکارهێنانی وشەی کورتە حیکایەت _ novelli لاداوە » . بەڵگەکانی مری لێرەدا تارادەیەك شێواوە ، چونکە ئەم دەیەوێت دووپاتی بکاتەوە کە بەهۆی هەڵبژاردنی ناوێکی دیارەوە کارە بەخشانە کورتەکانی فەنلەندییەکان پشتگوێ خراون ، کە دەکرێت ( بەئاستەم ) شایستەبن‌و لەگەڵ بنچینە باوەکاندا گونجاوبن ، بەڵام بێگومان ئەمە بۆ نووسەرە ناودارەکانی وەکو ئاهۆ ، یۆتونی ، سلانپاوهانپا بۆ نموونە وەها نییە ، کە بەلای مری خۆیەوە پێویستە گشت جۆرێك لە جۆرەکانی بەرهەمی پەخشانی کورت بە novelli واتە کورتە حیکایەت ناو ببرێت ، ئەمەیش داوایەکی تارادەیەك بێئەقڵانەیە . چونکە ئەمە کارێکە دەمێکە پەیڕەو کراوە . هەروەها دەشڵێت خۆی گشت بەرهەمەکانی یەکەم جار وەکو کورتە چیرۆك نووسیوەو . دوایی هەندێکیانی کردووە بە

رۆمان ، وایش دیارە تەنها کورتو درێژی بەلای ئەوەوە پێوانەی جوێکردنەوەیە ، چونکە دەڵێت کاتێك کە دوو بەرهەم دەربارەی یەك بابەت دەنووسێت ، « درێژەکەیان دەکرێت ناوی رۆمانی لێبنرێتو کورتەکەیان ناوی کورتە چیرۆك بێت » .

خۆ ئەگەر هەندێك ناماقوولیانە لە بەرهەمەکانی مریدا هەبێتیش بەوجۆرە نییە کە باسکراوە ، ئەگەر چیش تێکەڵکردنی وردە شتە ساکارەکان لەگەڵ راستییەکاندا پەیوەندیەکی بەتینی بە بابەتەکەوە هەیەو ، ئەگەرچیش بەلای ئەو خوێنەرانەوە کە بە بەرهەمە کلاسیە وردچنراوەکان راهاتووندا دیاربێت ئاسایە ،

لە راستیشدا وردە شتە ئاسایەکان جێگای تایبەتی خۆی لە دارشتنی کاری ئەدەبیدا هەیەو ئەم نووسەرە وەکو داهێنراو هەڵبژاردنێکی تایبەتی لەمەوبەر بەکاریهێناوە ، وەنەبێت هەر تەنها بۆ دروستکردنی وێنەیەکی زەینی دەربارەی دنیایەکی تێکئالۆزوبۆش لە واتا بەکاری هێنابێتو بەس . بەڵکو بۆ هەڵهێنجانی ریالیزمی بەشێوە نووسینێکی زیندوو ، چونکە ئەم نووسەرە خاوەند تاقیکردنەوەیە لەوەی لەرێگای پاڵەوانەکانییەوە سەرنجی درەختێك یان تەختەی بۆ زانینەکان یان ئۆتۆمبیلێکی سەرجادە یان پاسکیل سوارێك بدات . تا ئەگەرچیش ئەم شتانە بە هیچ جۆرێك کاریش نەکاتە سەر ژیانی . جیهانی مری بە شێوەیەکی گشتی جیهانێکی کارانەیەو ، گومان لە سروشتی دەروونیی مرۆڤ دەکاتو ، زیاتریش هەر سەختە . هەروەها بەرهەکانی خالیش نین لە وردبوونەوەو جرانی ئەگەرچی ئەوەندەیش ماوەی بۆ ئەم جۆرە شتانە نییە .

« کالڤی هایکارا » کتێبێکی دەربارەی مری بەناونیشانی « ئائەوە ولاتە زێرینەکە بوو » بلاوکردەوە ، هایکارا لەم کتێبەدا بەڵگەیەك دەربارەی مری پێشکەش دەکات کە چۆن بەبێ بازدان یان گۆڕان لە باسکردنی سیماکانی دەرەوەوە پەڕیوەتەوە بۆ دەربرینی بیرورراو هەستی پاڵەوانەکانی ، لەو رستەیەدا کە هایکار هەڵیدەبژێرێت هەندێك لە پاڵەوانەکان بە بەلەمێك لە ئاوێکی پانوبۆر دەپەڕنەوە ، ئەم رووداوە یەکەم جار بەشێوەیەکی مەوزووعیانە باس دەکات ، بەڵام دوای ئەوە : « خۆرەکە تیشکێکی رەنگ زەرد بەسەر رۆخە دوورەکەی دوای بەلەمی پەڵە هەورەکانو بورجەکەدا دادەرژێنێت . ئائەوە ولاتە زێرینەکە بوو . ئەوێ هەمیشە ئێجگار دوور بووە ، تاوەکو ئەگەر بیشیگەیتێ وەختێك دەبێت کە خۆرەکەی لێئاوا بووە . لەو ماڵە رەشانەدا ئاوابووە کە لە دار دروستکراونو ، کە نەخۆشەکانیان خۆیان لە قیر گرتووە . لەوێدا مندالان لە جەنگەڵەکاندا خالۆزە دەکوژنو کچە سەروعوزر شۆرەکان برۆیان بە پارچە خەڵووزی ئاگردانەکانیان رەش دەکەن » . یەکەم شتێك کە سەرنج رابکێشێت ئەو شێوە سریالییەی سەرنجەکەیە ، دوایش ئەو راستییەی کە ئەم سەرنجدانە راستەو خۆو بەبێ گۆڕان دەیخاتە پێشچاو ، هەروەها وەکو خواستراوێکی ئاسایش نەخراوەتە پێشچاو ، بەڵکو بەتووڕ هەڵدان تووڕ هەڵدراوەتە ناو جیهانەوە .

لەبەرهەمەکانی مریدا چەندین پەرەگرافی لەم بابەتە هەیە . بۆ نموونە با ( هەلاتن ) بگرین کە بەسەربازێك رادەگەیەنرێت بەهۆی هەلاتنەکەیەوە لە سوپا گوللە باران ناکرێت بەڵکو بۆ شوێنەکەی خۆی دەنێردرێتەوە لە سوپاکەدا ، لەکاتێکدا کە دەست بە رۆیشتن دەکاتو بەسێبەری گردۆلکەیەکدا تێدەپەڕێت .. دنیادا دیاربوو وەکو ئەوەی پڕ لە داوی ئاسۆیی ئەوەندە جوان بێت کە بە ئاسانی لەشی بسمنو بیکەن بە قازقازی نزیك لەیەك . سەرتاپای جەستەی کەوتە هەڵلەرزینو هێڵنجیداو رژایەوە . ئەم شێوە نووسینە هەر تەواو دەربرینیانەیە ، چونکە هەستو سۆزو ، بیرورراو بارە هەڵچوونە دەروونیو کرژبوونەوە ئەقڵییەکان پیشاندەدات ئەویش لەرێگای گۆڕانێکی راستەوخۆی دنیاوە ، نەك بەرەمز یان مەجاز .

پرسیارێکیتر هەیە زۆر جار لەگەڵ مریدا گفتوگۆی لەسەرکراوە ئەویش ئەوەیە ئایا پاڵەوانەکانی بەشێوەیەکی ئەقلانانە رەفتاردەکەن یانا ؟ ئەوانەی لەگەڵ ئەوەدان کە پاڵەوانەکانی نائەقلانانە رەفتار دەکەن زوربەن ، بەلام هایکار

لەم رایەدا لەگەڵ ئەواندا نییەو چەندین لاپەرەی کتێبەکەی بۆ پووچ کردنەوەی رایەکانیان تەرخان کردووە . ناتوانین نکوولی لەوە بکەین کە پاڵەوانەکانی مری زیاتر بەشێوەیەکی خاڵی لە واتا رەفتار دەکەن ، مری هۆی ئەو جۆرە رەفتارانە دەداتە پاڵ ئەوەی پاڵەوانەکانی لە دۆخی سەردەمی جەنگدا دەژین کە پێشبینی بۆ هیچ شتێك ناکرێت تیایداو ، هیچ شتێکیش واتای نییە . لە لایەکی تریشەوە پاڵەوانەکانی بە شێوەیەکی گشتی زیرەکترین‌و ئازاترین‌و بزێوترین کەسانن‌و ، کە بەو جۆرانەیش رەفتار دەکەن لەبەر ئەوەیە دەیانەوێت نارەزایی خۆیان بەرامبەر بە دۆخە دەربڕن کە نەکەس بەرگەی دەگرێت‌و نەیش دەکرێت بە شێوەیەکی ئەقڵانانە چارەسەر بکرێت . مری دووپاتی دەکاتەوە کە ناماقوولی وا لە فەلسەفەی ئەو سوپایانەدا کە بۆ جێبەجێکردنی پلانی توندوتیژی‌و رووخاندن پێکهێنراون ، بەڵام هەروەها پێویستیشە ئەو کارانە بەپێی رێ‌و شوێن‌و یاسایەکی وردبکەن . بەلای مرییەوە باشترین سەرباز ئەوانەن کە مل بۆ رێ‌وشوێن‌و یاسا نادەن ، بەڵام زیاتریش لەسەر ئەوە دلرەقانە لۆمە دەکرێن .

لەژیانی شارستانیدا مری زۆرتر هەر باسی ئەو کەسانە دەکات کە ناتوانن لەگەڵ یەکتردا پەیوەندی‌و دۆستایەتی دروست بکەن‌و ، هەریەکەیان لە چوارچێوەی جێگا تایبەتییەکەی خۆیدا تارادەیەك بە شێوەیەکی ئەقڵانانە هەڵسوکەوت دەکەن ، بەڵام لەبەر زۆریی جیاوازی‌و تووڕەیی‌و ناکامی بەو ئامانجانە ناگەن کە هەولی بۆ دەدەن ، بەڵام ئەوکارانە نابنە هۆی کارەساتی توندوتیژو ناکۆکی ، زیاتریش لەکۆتایی چیرۆکەکەدا پاڵەوانەکان بەتەواوی خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی لەسەر هەولەکانی پێشوویان بەردەوام بن .

دەشێت بوترێت « ئەنتی هوررو »ی لەدایکبووی ساڵی ١٩٣١ لە زۆر لاوە لەگەڵ مریدا جیاوازیی نییە ، ئەوەندەی مەسەلە پەیوەندیی بە روخسارو شێوەی کارە ئەدەبییەکانییەوە هەبێت ، هیچ جۆرە جیاوازییەکی جەوهەری لە نێوان کورتە چیرۆك‌و رۆمانەکانییەوە نییە ، چونکە هەردوکیان هەمان جۆرە بارو دۆخ‌و پاڵەوانیان تیایەو جەوهەری جیاوازییەکانیان تەنیا لەکورت‌و درێژییاندایە . لەلایەکی تریشەوە بابەتەکانی هوررو بە تەواوی لەبابەتەکانی مری جیاوازن ، نەك هەر تەنها لەبەر ئەوەی هوررو باسی چالاکیی رێکوپێکی‌و بنیاتنەرانە دەکات‌و بەس ، بەڵکو لەبەر ئەوەیش چونکە پاڵەوانەکانی زیاتر سەرکەوتوون لەو ئەرکانەدا کە پێیان دەسپێردرێت . چیرۆکێکی‌تر لە کورتە چیرۆکەکانی ( بیر هەڵکەندن ) هەمان جۆرە چالاکیی کردارانە باس‌دەکات ، کە بەبێ‌هیچ گومانێك بەسەرکەوتن کۆتایی دێت ، دوو زەلام ، خاوەند زەوییەك لەگوێ شارێك‌و برادەرەکەی ، دەست دەکەن بەهەڵکەندنی بیرێك لە پارچە زەوییەکەدا ، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوەندە شارەزای ئەم کارەنین ، بەڵام هەر لە کارەکەیاندا سەردەکەون . لە رۆمانی ( لێواری دنیا )ی ئەم نووسەرەدا تیپێك لە پیاوان دەستدەکەن بەبارگەیەك بۆ راوە ماسی بەدوو بەلەمی ماتووڕ دارەوە . یەکێك لە دوو بەلەمەکە یەکی دەکەوێت‌و بەدەم باوە دووردەکەوێتەوە ، بەڵام ئەو رووداوە نابێت بەهۆی کارەساتێکی پڕ مەترسی ، بەڵکو رۆژی دوایەکەی دەدۆزرێتەوە . پاڵەوانەکانی هوررو بەبێ هیچ گومانێك پێچەوانەی پاڵەوانەکانی مرین ، چونکە لە دنیایەکی ئەقڵانانەدا دەژین‌و گشت جۆرەکارێکی گرنگ‌و داهێنەرانەی تیادا دەکەن . هوررو بایەخ بەشتی ئاسایی ساکار دەدات‌و ، ریالیزمییەو خاوەندنی شێوەیەکی مەوزووعیانەو بایەخ بە باسکردنی ورده شتەلاوەکییەکان وەکو شتە سەرەکییەکان دەدات .

لەگەڵ نووسەرانی قوتابخانەی رۆمانسییانەی نوێدا لە فەرەنسا بەراوردکراوە بەتایبەتیش لەگەڵ « رۆب ـ گرێ »دا ، بەڵام ئەم بەراووردانە تارادەیەك هەر روو کەشانە بوونە .

هوررو هەندێك جار بیرورای وەها بۆ پاڵەوانەکانی هەڵدەبەستێت کە لەراستیدا ساکارو

نادیارنین ، له ( بیر هەلکەندن )دا پالەوانە سەرەتییەکەی دەربارەی مۆسیقای بارتۆکو ، تابلۆنویکانو ، بەرهەمەکانی چیخۆف بیردەکاتەوەو دەدوێت ، له ( لێواری دنیا ) شدا هەمان شت روودەدات ، زەلامێك له چیرۆکەکەدا هەیە بیرلەوە دەکاتەوە بەوپەڕی بێبایەخییەوە بیروڕای تایبەتی وەها بۆ خۆی بدۆزێتەوەکە ناهەموارو خەڵکی بیزار کەربێت ، بەڵام له پڕێکدا هەست بە فراوانی سروشتو بەربلاوبی دنیاو بچووکیی ئادەمیزاد دەکات له نێویاندا . دوو شاعیرو هەندێك له نووسەرە فەنلەندیەکان وایان باسکردووە کە لەو شاعیرە کە مانەیەکە له فەنلەندەدا هەن .

مریو ، هورروو و ، چەند نووسەرێکی تری ..ڵانی پەنجا ئێستا لە کلاسیکییە نوێیەکان دەژمێردرێنو نەوەیەکی ئەدەبییتر لەدوای ئەمانە دەرکەوتووە . نووسەرە نوێیەکان زیاتر لەوانەی پێش خۆیان تیپ یان قوتابخانەیان پێکنەهێناوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا تایبەتێتیی ناوکۆیان هەیە .

ئەمانە زۆر جار بەرەنگاریی نەریتە ئەدەبیو زمانەوانییە باوەکان دەکەن ، ئەمەیش لە فەنلەندەدا شتێکی نوێیە ، ئەمان حەز بەرەخنەی راستەوخۆو لە روودەکەن دژی دۆخە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان بەبێ هیچ خۆلێلادانێۆو ، ئەگەر چیش بەرەنامەیەکی ناوکۆی دیاریان ئامادە نەکردووەو هیچ ئایدیۆلۆژیایەکی باویشیان پەسەندنەکردووەو ، بەبێ خۆلادانیش پەردە لە ڕووی لایەنەشاردراوەکانی سێکس دادەدڕن .

« یۆرکی پلنین »ی لە دایکبووی سالی ١٩٤٠ یەکێکە لەم نووسەرانەی کە بە شێوەیەکی ببڕای‌ببڕ گشت شێوە باوەکانی لە شیعرو پەخشانەکانیشدا توورڕهەڵداوە ، یەکێك لە دوا

بەرهەمەکانی ( تائیستایش هەر بەرەنکاردەبمەوە ) زەحمەتە بخرێتە هیچ خانەیەکەوە لەوە زیاتر کە دەقێکی ئەدەبیی هەندێك درێژە . دەشێت بە رۆمان ناوی ببەین ، چونکە هەمان پالەوان لە گشت بەشەکانی کتێبەکەدا هەڵسوکەوت دەکات ،

بەڵام لەبەرئەوەی بەشەکانی کتێبەکە ئەوەندە پەیوەندیان بەیەکەوە نییە ، جگە لەتەنها پالەوانەکە نەبێت ، بۆیە دەشێت بە کۆمەڵە چیرۆکیش ناوببرێت . یان بە پەخشانە شیعر ، چونکە بێگومان چەندین برگەی شیعریشی تیایە .

گشت نووسەرە لاوەکان وەکو پلنین دوژمنایەتیی گشت شێوە باوەکان ناکەن . « هانو سالاما » کە لە سالی ١٩٣٦ دا لە دایکبووەو ، دوای مەحاکەمە کردنو بەندکردنی

بەهۆی ڕێزنەگرتنی شتەپیرۆزەکانەوە ناوبانگی دەرکرد ، رۆمانیشو کورتە چیرۆکیشی بە ڕێبازێکی باونووسیوە ، بەڵام ناڕەزایی دژی نەریتەکانی کۆمەڵ زۆر توندوتیژبوو ، هەوڵیداوە بە شێوەیەکی تارادەیەك بێشەرمانەو بەوپەڕی لەروویەوە باسی چالاکییە سەکسییەکان بکات .

سالاما لە زۆر لاوە لە « پەنتی ساریکوسکی » دەچێت کە لە ساڵ ١٩٣٧ دا لە دایکبووەو وەکو شاعیر ناسراوەو ، پەخشانیشی نووسیوە ،

هەردووکیان دوودڵو نیگەرانن لە ناو کۆمەڵێکی بورژوازیانەداو ، بە بەرەنگاری کردنو بەبێ خۆلێلادان ڕووبەڕووی نەریتە شڕەکانی ئەو کۆمەڵگایە دەبنەوە . هیچ کامێشیان پێیان ناکرێت باشتر لەوەی هەیە بدۆزنەوە ، لە دوایشدا

هەردووکیان زیاتر هەر دەربارەی خۆیان دەنووسن . ئەمانیش لەو نووسەرە لاوانەن کە گومان لە ڕەوایی ئەدەب دەکەنو بەبێ ئامانج خەریکی مەستیو سێکسن .

« تیۆ موکا » کە لە سالی ١٩٤٤ دا لە دایکبووە ، داهێنەری پالەوانێکی خاوەند کەسایەتییەکی زۆر تایبەتییە ، دەشێت لە واقیعدا رۆمانسییانەبێت ، هەندێك جاریش

پەخشان بە شێوەی شیعر دەنووسێتو ، هەروەهایش بە شێوەیەکی ریالیزمییانە باسی ژیانی بێتامی نوێ دەکاتو ، بە بێبایەخییەوە پێدا

هەڵوتنێکی سریالیزمانە بەڵام توندوتیژو بەکارانە دژی گشت ئەو بێئەقلیانەی دەنووسێت کە لەدنیادا دەکرێن .

# تەدیم ئاگر .. مەدل کەڤی

- مؤيـد طيـب -

١٩٨٠

— لێڤێت من کەون ...
دڤێن ل رەخو چانێت دێمێ تە بچەرن
دەستێت من دوو رێڤنگێت شەیدانە ...
دڤێن ل ناڤ بوهارا سینگێ تە بگەرێن
دێ یارامنێ ..
کەوا بچەرینە ...
رێڤنگا بێ هیڤی نە زڤرینە .

— کەوێت خو هیکە چەرا ئاگری ...
من دێم ئاگرە ..!
سەرهاتێ یا «دمدم»ی بو رێڤنگێت خو ئەگێرە
من سینگ پائیزە... بەفرە... باهورە !!

= کەوو ئاگر ..؟!
رێڤنگو پائیزو باهور ..؟!
نەبی نابت ..
کەو فێری ئاگری نابت .

= کەو ئاگرن .. کەو ئاگرن
رێڤنگ بوهاری ژ بەفرو پائیزا دکرن !!

— هۆ یارێ ئەز نیکلەکێ ئاسنی ژکیرێ بینم ؟
دا ل ئاگرێ دێمێ تە بچەریتن ...
خانێ لەپ زێرین
دێ ب چ ڤەژیتن ..؟!
دا ل پائیزا سینگێ تە بگەریتن
نە ئاسن مایە ..
نە عیسا مایە ..
نە خودێ ژی ئەڤروکە خودانێ ...
ئاخو روبارو ئاگرو بایە !!

— من دێم ئاگرە ...
ئاسن لێ دچەریت !
من سینگ پائیزە... بەفرە...باهورە...
خانێ لێ دگەریت !

= مەمێ ئالا ...
هەر لێڤ هەبون
تو ل دێمێ زینا خو دچەری
دێ کیڤە چی ..؟
تو ل چ دگەری ..؟

خو ل چەرخا دنیایێ بگرە
سالێ روبارەو ...
ئەڤ ئاخە دێ هێتە بەری .

= مەمێ ئالا ...
ل کوبراتیا زیندانا خو
کەلا خانێ ددلێدا بو
مەمێ ئالا ...
ل درێژیا شەڤا تاری
بەستا ئاگرێنا عەشقێ
ژ دلو هناڤا دباری
کەنگی مەموی هەر لێڤ هەبون ؟!
کەنگی مەموی هەر دەست هەبون ؟!
کەنگی مەموی خو ل چەرخا دنیایێ گرتو..
بوهار ژێ دچون ؟!

— تە دێمو رویمەت ئاگرن یارێ ...
مە لێڤ کەڤینە ..
ئەگەر کەڤی حەلیانو ئاگری نێچیرا خو کر
مە بەسە بونە جوکەکا ئاڤێ ...
تێهنێ دەست هاڤێتە گوپالێ خو
ژ چاڤێت تە بارکر
تە سینگ بائیزە ... بەفرە ... باهورە
مە دل رێڤنگن ...
ئەگەر کەتنو « بنەجهـ کوڤانا » خو نە دیتن
مە بەسە بارەنەك بێتو سینگێ تە ...
گورێ مە بیتن !!!

* * *

● **دڤێ هوزانێ دا من دوو کێشێت بکارئینایێن .. کێشا شەنگستە پێنج بو دەنگێ ئێکێو دووێ .. کێشا شەنگستە چار بو دەنگێ سێیێو چارێ دا کو هەر دوو رەنگێت دەنگا ( — ، = ) باشتر ژێك دیاربن ئەڤە ژی تەکنیکەکا دراميیە گەلەك یا دهوزانا نوی دا بکارهاتی من ژی ژلایێ خوڤە یا هەولـدای بکاربینمو ئەز نزانم کانێ ئەزێ سەرکەفتیمە تێدا یان نە .**

# لەشکری برسێتی ... زیندان

شیعری : نازم حیکمەت
وەرگێڕانی : محەمەد مەلا کریم

## — ١ —

## لەشکری برسی‌یەتی ڕێ ئەکا

لەشکری برسی‌یەتی ڕێ‌ئەکا
بۆئەوەی ڕێ‌ئەکا پرسەی نان بە دڵی بشکێنێ
بۆ ئەوەی پرسەی گۆشت بە دڵی بشکێنێ
بۆ ئەوەی پرسەی کتێب بە دڵی بشکێنێ
بۆ ئەوەی پرسەی ئازادی بە دڵی بشکێنێ ..
ڕێ‌ئەکا ، پردەکان جێ‌دێڵێ ، وەك دەمی شمشێر ئەبڕێ
ڕێ‌ئەکا ، دەرگائاسنینەکان ئەسمێ ، شووراى قەلاکان ژێروژەبەر ئەکا

پێ لەناو خوێنا ڕێ‌ئەکا ..

لەشکری برسی‌یەتی ڕێ‌ئەکا
بە هەنگاوی بە ترکەو ناڵەوە

بە سروودی ئاگرەوە
بە هیواوە بە ئاڵای مەشخەڵ شێوەی
بە هیوای هیواوە ..

لەشکری برسی‌یەتی ڕێ‌ئەکا
شاران بە کۆڵانو ماڵە تاریکەکانیانەوە

ئەگرێتە کۆڵ
دووکەڵ کێشی کارخانەکان ئەگرێتە کۆڵ

لەگەڵ شەکەتیی ئەبڕاوەی کاتی دەرچوون لە کارخانەکان ..





سوپای برسی‌یەتی ڕێ‌ئەکا
ڕیزی کۆلیت‌نشینەکانیش

بەدوای خۆیدا بەکێش ئەکاو ئەیانبا
ئەوانەش کەوا ئەڕۆنو

چنگی خۆڵ لەم خاکە بێ پەرو نەبراوەیە لەگــەڵ
خۆیان نابەن ..

سوپای برسی‌یەتی ڕێ‌ئەکا
بۆئەوە ڕێ‌ئەکا نان بە برسی‌یەکان بدا

بۆئەوەی ئازادی بەوانە ببەخشێ شکی نابەن
پێ لەناو خوێنا ڕێ‌ئەکا ...

— ٢ —

## لە زیندانی ئەستەموولدا

لە ئەستەمووڵ ،
لە حەوشی بەندیخانەدا ،

لە ڕۆژە خۆرەکانی
پاش بارانی
زســتاندا ،

تاتێ کە پەڵە هەورەکان ، دیوارەکان ، ســواڵەتە
سوورەکانو سەرو سیمای من
لە چاڵاوەکانی زەویدا ئەلەرزن
بیرم کردەوە : چەند مەردە ،
چەند نامەردە ،
مرۆڤــایــەتی !

لە ژێر هەمووی قورسایی هەرچی‌یەکدا پێی‌بڵێن
هێزا ،
هەرچی‌یەکدا پێی‌بڵێن بێ‌هێزی
بیرم کردەوە لــە گیتی ،
لــە وڵاتەکەمو ،
لــە تــۆ .

زیندانی ئەستەمووڵ
شوباتی ١٩٣٩

# غەوسی هیزانێ و پاییزۆک

عبدالرقیب یوسف

پاییزوك سترانەکا کەڤنا کوردییە سترانەکا رەوانو خوشو د کوردستانی دا بلاڤە لێ ل بیرا سترانبیژان نەمایە کو د چی چاخیدا هاتیە گوتنو کێ هونادیە چونکە زو ناڤێ خودانێ ستران ونبوون کەم نەبن وەکو عەڤدالێ زەینی ( سەرداری سترانبیژان ) ئەگەر چەند سترانبیژان وی ب سەرداری خویان دزانن لێ گەهشتنا ناڤێ وی ژ ( قەرەکوسە ) دباکورا روژئاڤایا ( گۆلا وانێ ) هەتا بەهدینانو هەرێما هەولێرێ ژی ژبەر وێیە کو ( عەڤدال ) ناڤێخوە دهندەك سترانێن خوە هینایە .

لێ خودانێ پاییزوکێ هاتیە ژبیرکرنو سترانبیژ نزانن سترانا کێیە گەلەك باش بو دهاڤینا ١٩٧٧ دا ئەڤ سترانە ب نڤیسی ب خەتێ مەلا زەکی مەیتیی کەتە دەستێ منو نهوژی لنك منەو من ژویو چەند کەسەکیتر وەکو برایێ وی مەلا صالحو خەلیفە مەلا عزیزێ هیزانی — زانی کو ئەڤ سترانە ژ دانانو هونادنا غەوسی هیزانییەو غەوس هەفت پاییزوکی وەها هونادیەو دیسان من گوهـ لێبو کو یەك ژوان پێشیا ( لوری لوری )یەو ل ( نورشین )ێ ژی من ژ شیخ نورالدینی کورێ شیخ معصوم زانی کو غەوس چەند سترانەك دانینەو ئەڤا هەژی هندەك ژ سترانەك یاوییە :

**« پاییزە سەرێ سبێ بایێ ڤێ سەقەمێ ل م سارتێ**
**دەنگێ کەوا کوزەل ژ زنار تێ**
**حەیفا منێ نایێ ب تو حەیفێ حەیفا منێ تیتو بوێ حەیفێ**
**چەوا خەوا ڤیزا بوکین ل پاخلێ مێرێ کال تێ »**

ژ بەر وی کو ئەو پاییزوکە یاغەوسە ئیتر هندەك شیخو مەلا ژبیر نەکرنەو ژزوڤەژی من ژ سترانبیژانو ژخەلکی گوهلێبویە کو دگوتن گوتنا پاییزوکێ خێرە لێ ( لاوك ) ل نك هندەك دیندارێن هێشت حەرامن نەدورە ئەڤە ژوی هاتبی کو پیشیان زانییە کویا شێخی ب ناڤوبانگە ( غەوسێ هیزانێ )و هەروەها چونکە بیهنا دیانەتێ ژی ژێ تی چکو ناڤی محمد پێغەمبەر تێدا تێو هەروەسا ناڤێ نەبی عیساو ناڤێ ( ابن حجر )ێ یاکو ب ناڤودەنگترین کتیبا شریعەتییە دکوردستانیدا هەروەها ناڤی ( جامێی ) یانی مزیەفت ژی تێدا هاتیە .

ژڤان تشتین بوربی تییە زانین کو خودانی وی مروڤەکی دیندارو زانا بویەو هەروەسا ژ چەند گوتنەکی تری ئەدەبی بەرزو خودان بها ژی وەکو پەسندانی چاڤی دلبەری ب پرخوماریو تەشبیهی برهێن وێ ب ( کەڤانێ ئەنگی ) کو تەخلیتەکی تیرو کەڤانایەو ئەگەر ئەم بچین سەر ئەسلێ ووشێ « ئەنگی » دبی ژ هەسێ ( قەصدیر ) و یان ژ ( رصاص ) بێ چونکە ( ئەنگی ) د ئەزمانێ سومریو اکدیو سنسکریتی و عبریو سوریانیو جبشیو ارمنیدا ب مەعنا رصاصو یان قەصدیر هاتیە[١] .

هەروەسا دبینین سترانبێژ ژهوســـــتایی داخاز دکە کو ئـەو خەزێما ژ کەلەش کوباراوبرا چێکە بێخی نیڤ کاغەزا ( سەمەرقەند )ێ دا یـا کو ل ڤی بازاری میژوی دهاتە چێکرن‌و کاغەزەکی بەرکەتی بویە هەتا ببی بابەتێ وی خەزێما نازکو سپەحی یاکو نەکەتی سەر سندانی‌و نەکلبتان‌و نە چەکوچ‌و کرانی هوســــتایی ژی نیزیکی نەبیی‌و بازاری ( سەمەرقەند ) ێ تورکستان بو یەکـــەم جیگەی دروســـــتکردنی کـاغــەز دکـاتی ( سلجوق )یەکاندا بو یەکەم جار کە مسلمانەکان فیری کاغەز دروستکردبون لە چینەوەو پاشی لە ( ســمرقند ) وەکاغەز دروستکردن بەلاوبو لـــە ولاتە مسلمانەکان .

غەوس ( غوث ) ژ مەزنترین شیخ‌و مروڤێن ئاینداریێن کوردا بویە د ســـــەدی نوزدەهێن‌داو خەلکی دەڤەرا هیزانێ‌و بدلیسێ‌و وانێ‌و موشێ‌و گەلەک جهێن‌تر باوەری پێ تێنان هــەتــا ل نیڤ واندا ب غەوس نـاڤوبـانگی بلاڤ بو و ناڤی وی ( صبغة الله ) هاتە ژبیرکرن‌و هەتا ئەڤروژی .
ئەسلێ مالا غەوسی دگەهێ مالا (ئاروواسێ) یا ب ناڤو دەنگ دبارا خوێندنێ‌دا غەوس خەلیفێ ( سید طه ) بێ نهری ( شەمزینی ) بویە یانی سەید طاهایێ مـەزن بـاوکێ ( شـــیخ عبیـدالله )ێ شۆرشگێرو خەلیفێ ( مەولانا خالد ) .

غەوس تەکیاو مەدرەسا خو ل سەر گردەکی ئاڤاکر ب دو ڤاتی نیزیکی هیزان (٢) دنیڤ باغو بوستاندا راسەری دەشتا هیزانا رەنگین یاکـــو مروڤ دبیژی پارچەیەکا بەهەشتی‌یەو مەدرەســـا وی ژمەزنترین خوێندگاهێن کوردستانی بو پربو ژ فەقیان‌و سەیدایێن زانا لەگەل ســـــەرەکی هەمیـــان ( مەلا خالدێ ئولەکی ) وەکو دبیژن ل ریزا ( مەلا خلیلێ ســێرتێ ) و ( ابن آدم ) بویـە گەلەک خەلیفێن غەوسی هەبون وەکو ( ســەیدایێ تاخێ ) کو ل نورشینێ ل دەڤێ دەشتا موشێ دا جێهنشین بو . و هەتا ئەڤرو ناڤوبانگێ وی وەکو پێ شیخێ وی مایە د سالا ( ١٢٨٧ ) مشــەختی ( = ١٨٧٠/١٨٧١ زایینی ) کـــوچی دواهیێ کریە (٣)و روژا ١٠-٨-١٩٧٧ دا چوم ســــەر گورا وی دوی کاڤلێ پشت مەدرەسا وی‌دا پاش کو ژسەر گورا ( سینەمێ ) ل هیزانێ ژڤریم .

پاش مرنـا غەوسی ئیشــێ شیخایێ کەتە دەستێ ( شیخ شهاب الدین )و کاروباری مـالو عەشیرەتان کەتە دەســـتی ( ســـــەید عەلی )و ئیش‌وکاری مەدرەسی کەتە دەســـــتی ( محمد شـیرین ) هەتا سالا ( ١٩١٣ ) ئەڤ هەرســـێ قەهرەمانە شۆرشەک گەش کرن‌و هێرش‌برنە سەر بازارێ بدلیسێ‌و هەر سی شەهیدبون لێ هـــەر زێندونە د روپەرێن میژودا .

بەلێ غەوسی مەزن دیـارە زەوقەکی ئەدەبی هەبویەو گەلەک حەژ ژســتران‌و فولکلورا کوردی کریە هەتا ئەڤ پاییزوک‌و شەش ســـــترانێن‌تر دانینەو دیارە قەدرگرتنا ســـتران‌و فولکلورێ ژ ئالیێ ویڤە تێهنەک دایە هندەک خەلیفێن وی ژی هەتا ســــــەیدایێ تـاخێ ( عبدالرحمن ) ژی سترانبێژی خو هەبویە .

پاییزو کاغەوس لەگەل پشکەک ژ سترانین کەڤن وەکو سترانا سینەمێ‌و ، هەسـام ئاغاو ســـتیا لـەعلی خـانێ‌و ، حـەیران‌و ، نێـرینێ عـەفنو سەیدکو ، شاهینا ژوان‌را دبێژن « ســـترانێن گران » چونکە ئاوا زاوان گرانەو نەسفکە وەکـــو لاوکان هەتا نهو ئەو ئاوازە نە هاتیە بلاڤکرن یانی ستران پێ نەهاتنە تومارکردن وەکو خو تەنیـــــا شاهینا نەبێ ئەو ژی کاک عیسی بەرواری بچەکی سڤک‌کریە .

## میژویا پاییزوک

وەکو ئەم هەمی دزانین هندەک ســـترانین کوردی هەنە ب ناڤی « پاییزوک » ڤە هەر وەکـو هندەک ب ناڤی ( لاوک ) ڤە ئەڤ پشکاهە هەتا چ میژوەک دچێ دچ چاخی دروست بویە ئایا ئەڤێن‌هە ناڤی خویان ژ پاییزوکا غەوس وەرگرتنەو پیشیا هەمیـــان ئەوە بویەو غەوس یەکەم دانەرێ ئەڤ تەخلیتا سترانایە دســــەدا نوزدەهێ داو یــان

کەڤن‌ترن‌و ڤا غەوس ئێکە ژوان ئەگـەر چـەنـد ژهـەمیـان بلاڤ‌تـرەو ئـەو نـاڤـە هلگرتیـە ؟ ئایا ( خەزێموک ) ژی ناڤی خوو کوسترانەکو یان بڕەک ســــتران هـــەر ژ خـــەزێموکا دنیڤ ڤێ پەیزوکێ دا تێ وەرگرتیەو یان ئەو ژی پیش وی هـەبویـەو یان ســـترانبێژان خـەزێموک ژ ڤی دریژکرنە ؟ ئەم هەتا نهو نکارن بەرســــڤا ڤان پرسیاران بدێن‌و جهێ ســـپاس‌و دلخوەشییە

ئەگەر هندەك برادەر ل ڤىيەكى بيرسن‌و بكولن‌و بلاڤبكەن .

ئەوا بابەتا گوتنە برادەر ( رێكێش ئاميدى ) د ( هاوكارى ژمارا ۱۹۷۸/۱۰/۲۰ ) دا چوار كەرتك ب ناڤى ( پاييزوك ) ڤە بلاڤكريە ئەو ژى وەكو ستران‌بێژان نەزانيە ياكێيەو تشتەك دەرباراوى نەنڤيسيەو ئەگەر چەند جودايى ژى هەيە لگەل ڤى پاييزوكامە لێ هەر تشتەك ژێ ئەوە وەيان پاييزوكەكى ترە هندێك ژ يا غەوس هاتيە وەرگرتن‌و يان هەر ئەوە دەستكاريا وى هاتيەكرن ژ ئالێى ستران‌بێژان ڤە ؟ وەكو ئەم هەمى دزانين ستران وەكو خو نامينى ژ هەرێمەك ( جهەك ) تا هەرێمەكێ جودايى هەيە هندەك ژى تێتە گورين‌و ب سەرڤەتيبە زيدەكرن ژى نهو چەند تەخليت ( رواية ) سترانا سينەمێ‌و يا هەسام ئاغاو ستيا لەعلى خانى هەيە هەريەك د هەرێمەكدا هەتا سترانا سينەمى بگەهى سوران ( گەهشتيە هەتا كويسنجق )و هەروەسا ( فەرخ‌و ستى ) هەتا ژ بوتان‌و يان ژ ( مكس )ێ بگەهى ( موكريان ) ل كوردستانا ئيرانى‌و يان ژوى بگەهى ئەوان دبێ چەند گورين بسەردابێ‌و ئەو گورينانەژى نابن هويێ كزى‌و لاوازى بەلكو فولكلورا كوردى پێ دەولەمەندتر دبێ ل سەردەستێ ستران‌بێژين مە يێن هێژاو بەركەتى يێن كو ب ( روشنبيريا گەلى ) يان بيژين روشنبيريا فولكلورى هەرێمێن كوردستانێ پيكڤە گريدانە .

---

## سترانا پايزۆك

**ئاى دەرێ پاييزەكى ل من دەستدا بو**
**منێ نەكرى تو كارو بارێ ڤێ زڤستانێ**
**سەرهەلێ ژورين وەربونە ژمژو مورانى**
**دەشتكى ژێرين دخوازن رەشيبەكى تاڤبێ دبارانێ**

**هەرى كولمالێ كولمال بابێ تە لوارێ ژورين**
**دەى نەكر ئەمێ هاتنە وارى ژيرين مەحلێ دەستبەردانێ**

* * *

**هەرێ پاييزەكى لمن دەستدا بو چ پاييزەكى تەماشە**
**من جەوزەلێ گول‌و ريحانا هەبون**
**خودى دزانێ ڤيزيكى جيرانان كو يولداشە**
**سەد هەوار هەوار هەوارى دخودى نە**
**خەزال لدەشتێ نە**
**نێچيرڤان وى لپێنە**
**عەجيب ئەو عەجيبە كوماسى دبنێ گولان**
**كەسەرى وان تاسێ ئاڤێ نە**

* * *

**هەرێ ديسان كو هەرێ**
**هەرێ پاييزەكى ل من دەستدا بو**
**چ پاييزەكى وا لوەختە**
**برەكى سوارێ مە ژمالێ سوار بونە بزينو رەختە**
**خودێ دزانێ منێ دمالا بابێ دا نەكرى خوشى**
**دمالا مێرى دا طالو بەختە(٤)**

* * *

**ئاى هەرێ سەد جار ل من هەرێ**
**من حەرفەكى ديبو د ( ابن حەجەر )ێ**
**منێ مێزەكرى ژ هنگورێ حەيا فەجرێ**

**خودێ دزانێ وەزێ تەركا چاڤێ رەش‌و بەلەك ناكم حەيا روژا مەحشەرێ**

* * *

**هەرێ ديسان كو هەرێ**
**سبەيە دلێ من دبێژى الله اكبر**
**تە سەدەف‌و دو مەرجان ل سەر**
**يەكى وى عيسايێ نورانى يە**
**يەكى وى محمد پێغەمبەر**
**بەلێ وەزێ چبكەم كو ئاگەهم ڤوشەنگێ ڤان سواران**
**گەلو چونا بەهەشتى خوشە يان گەشتا ل گەل ياران**
**ئەى هەوار سەد هەوارە**

* * *

**ئاى هەرێ كچكێ كوكا تە ل پشتێ عەين‌زەرانە**
**لێ سەرێ زرهوكا ڤێ چارێ**
**وەمێ ژ پاييزوكێ بەس بكەن**

**فەگەرێنە خەزێموکێ**

* * *

**وەمێ چونە دەرێ دگانان پێدا پێدا**
**سەر هوستەکاران**
**هەرێ هوستائو تو ب خودێ کەی**
**خەزێمەکێ ژ کەلەش کوبارا م را چێکەی**
**ئای تو دانەینە سەر سندانێ**

**ئەگرە پێ کلبەتانێ**
**لێ مەدە ب چاکوچو ب کرانێ**
**دەینە ناف کاغەزا ( سمرقند )ێ**
**بلا نەگرێ دەنگێ فێ خودانێ**

* * *

**ئای هەرێ کچکێ کولمال بابێ**
**چەهڤێ تە چەندان ل من سپەحی نە**
**رەش پڕ خومارن ســـــەردە جوهتـــەك کەفـــانێ**
**د ئەنگینە**
**تو ب عشقا نەبی محمد بکەی**
**بەرێ خو ل من نە گەرینە**
**رەحمەت ل بابێ وی هوستایێ کو جامێ چێبکری**
**لەعنەت ل بابێ وی هوســــتایێ کو حەیاســـــو**
**ایجاد کری**

---

(١) تەماشـەی ئەم سەرچاوە بکە : تکملة المعاجم العربیە ، بەرگێ ئێکێ روپەری ٢٠٤ - ٢٠٥ چاپا بەغدا ١٩٧٨ ژدانینا رینهـارت دوزی ب فرنسی دکتور محمد سلیم نعیمی ، کریە عەرەبی . د ئەرمـــەنیدا تەنگ ( انج )ە . هەروەکو دسترانیدا هاتیە ئەڤامە گوتی ب گوێدا ئەسلی ناڤی ویەو ئەم نزانن چـەوا بویە .

(٢) هیزان بازارەکێ کەڤنێ کوردستانێ بویـــە نهو نزیکی بیســــت مالان دنیڤ سورهـو برجین ویدا ماتە ناڤێ وی دکتیبین میژویدا هاتیە دکەڤی باشورا روژئاڤایا گولا وانێو ژ ولایـەتـا بدلیســــێیە مـە دکتیبا خودا ( گەشـــتەکێ ئەرکولوجی د کوردســـــتانا باکوریدا ) گەلەك لـســـەر وی نڤیســـیە هەروەسا دەربارا غەوسو ( سینەمێ )ژی .

(٣) هنـدەك زانیـاری دەربارا غـەوسو بـرەك سترانبێژان من دا برادەر کـــاك محمـود زامـــدار ئەوی ژی بلاڤکرن د روژنـامـا ( العراق ١٩٧٨/٦/٣ )دا ب کورتی بەحسا غەوسی تیدایە .

(٤) طالو بەخت : یانی طالعو بەخت .

بەدەریا بنگەرێم دەریا تو وینم
بەسەحرا بنگەرێم سەحرا تو وینم
بەهەرجا بنگەرێم ، کۆه و دەرودەشت
نیشان ئەز روێ زیبایێ تو وینم

باباتایەرێ عوریان

# لەبێشکەدا

■ چیرۆکی : ئاکۆ تاجاوا

■ وەرگێڕانی : جزا علی

« آکو تاجاوا نیوسوکی » ١٨٩٢ – ١٩٢٧ چیرۆك نووسێکی لێهاتووە ، چیرۆکو شیعرو وتارو رۆمانێکی تەنیای نووسیوە.(١٥٠) چیرۆکی لە حەوت بەرگدا بلاوکردۆتەوە . دیارە بۆ گەلێك زمانی زیندووی ئەم سەرزەمینەش وەرگێڕدراون . ناوبراو بە ( بودلێر ) و ( ستداندبرغ )و ( پۆ ) سەرسام بوو .. تا ئەندازەیەکیش جۆرە پێکەوە لکانێکی سازاند لەنێوان ژیانی ساکاری یابانو سروشتی ( ستداندبراغ ) و خۆشەویستی ( پۆ ) بۆ ئالۆزکاویو ڕەشبینی ( بودلیر ) .

( لەبێشەکەدا ) یەکێکە لەچیرۆکە هەلبژاردەکانی .

* * *

فسەکانی دار بڕ لە لای قۆمیسەری پۆلیس

بەلێ گەورەم دلنیا بە من تەرمەکەم



دۆزییەوە !

**وەك هـــەمـــوو بەیانییەكی دیكـــە وەدەركەوتم ، تا ..**

بەشی خۆم داری ئورز ببڕم ، تـەرمـەكـە لەكۆختەیەكی شاخیدا ، هەروا (١٥٠) مەترێـك لە ڕێگای ( یاماشنا ) دوور ، بیشەیەكی لەداری ( ئورز )و قەدی قامیش دروســـــت كراو .. دوور لەڕێگاكە تەرمەكە لەسەر پشت كەوتبوو .. قوماشێكی حەریری شینی لەبەرداو سەرپۆشێكی بەسەرەوە شیرێك سنگی كون كردبوو .. قامیشی دەوروبەری شكابوونەوەو خوێناوی بوون ، ئـەو دەمی خـوێنی لـەبــەر نـەدەڕۆیی . پێـم وابێ برینەكەی وشـــك بووبۆوە . مێش و مـەگـەزی بێ‌شومار بەئەندازەیەك زۆربوون بە ئاســـتەم هەنگاوی خۆم لێ سەرودەر دەكرد . لێم‌دەپرسی شیرێك یان شتێكی لەو بابەتەت هاتە بەرچاوی ؟ دەڵێم نە هیچ شــتێك گەورەم ! تەنیا پەتێكم دی بەكۆتایی درەختێكی ( ئورز )ەوە بوو .

چاكە : لەپەتەكەش بەولاوە شــــانەیەكم دیبەوە ، ئـەوە هەمووی بوو . لەوەدەچێ پێش ئەوەش ئـەم بكوژرێ شەڕێكی باش‌كرابێ چونكە گژوگیای دەوروبەر بەتوندی شێلدرابوو .

— ئایا ئەسپی لێ‌بوو ؟

نا گەورەم ! مرۆڤ بەئەســـــتەم دەگاتـە ئەوێ ، چ جا ئەسپ !

* * *

## قســـەكانی قەشـــەیەكی بووزی ڕارەوی كە قومیسەر دواندویەكی

كـات دوێنێ ئێوارێ بـوو ، ئـەو پیـاوە بەدبەختە لە ( سیكاما ) وە بۆ ( ماشینا ) دەچوو ، ئافرەتێكی لەگەڵ بوو . ئافرەتەكەش وەك زانـرا ژنی وی‌بوو ، تەنیا جلو بەرگەكەیم دی ، ڕووی بەدەرەوە نەبوو ، لەوە دەچوو كەڵـەگـەت بێ ، (٤) پێ زیاتر لەسـەر ئەســـپەكەوە بەرز دیاری دەدا . من قەشەیەكی بووزیم زۆر بەوردو خوردی نەمروانی ! چاكە ، پیاوەكە شیرێك و تیروكەوانێكی پێ بوو . نەمدەزانی تووشی بەڵایەكی ئاواهی دێ ، ژیانی مرۆڤ وەك ئاونگی بەیانییە هەر بـەشــــی تیشكێكە ! قســـــەكانم بەسن تا ســـــۆزی من بەرامبەری دەرببڕن !

## قسەكانی پۆلیسێك كە قۆمیسەرەكە دواندوویەكی

ئەو پیاوەی گرتم ، ڕێگرو بێ ڕەوشت بوو ( تاجومارو ) یان پێ دەوت . كەگرتم لەســـەر ئەســـپەكەی بەربووبۆوە لە پردی ( آوتاكوجی ) كات سـەرەتای شـەوی ڕابردوو بوو ، بۆ ڕاستی‌و دروستی پێی لێ دەنێم دوێنێ وێـــستم بیگرم ، بەڵام حەیفێ هەڵات ! جلێكی شینی لەبەردابوو . هەروەها شیرێكی گەورەش ، ئەو تیرو كەوانـە لەهی مردووەكە دەكـا . بۆیـە وێ دەچێ بڵێین ( تاجومـارو ) كوشتوویەتی ، كـەوانەكـە بەژێی چەرم داپۆشراوە . توربێنێك (١٧) تیرو پـەڕی



هەڵۆی تێدابوو . وابزانم هەرئەوەندەیە . بەڵێ گەورەم ئەســــپەکەش هــەوە ، جوانوویــەکی ڕەســـەن ، ئەســـپەکەم دی لەپەنــا پردەکەوە

دەڕۆیی . حیکمەتێکی خــودایی ، وای کـــردووە لەئەسپەکە بەربێتەوە . لەناو هەموو دزەکـــانی ( کایوتو ) تاجومارو ئەوەیە ـ خەمێکی قورســـی داوە بە ژنانی شاری ! زســـتانی ڕابردوو ژنێکی کوشت کە لەگەڵ کچەکەیدا بۆ ســــــەرچاکی ـ کوریب ـ دەچوون . گومانی زۆری لێدەکرا . ئەگەر ئەو تاوانبارە کوشتبێتی تۆ دەتوانی ئــەوە دەرخــەی داخۆ چی لەژنــەکــەی کردووە ! داوا لەبەرێزتان دەکەم بەباشی لەم لایەنە بکۆڵنەوە !

## قسەکانی پیرێژنێکی پیر بۆ قۆمیسەری پۆلیس

بەڵێ گەورەم ! ئەو تەرمەزاوای منــە ! لــە ( کایوتو ) وە نەهاتووە . ( ساموریایە ) لەشاری ( کوکوفو ) لە هەرێمی ( واکاسا )یە ناویشـــــی ( تاکیهیکو ) نیە ( کانانوا )یە تەمەنی بیســـتو نۆ ساڵە ، زۆر بەڕەوشت بوو . من لەوە دڵنیـــام کارێکی ناجوری وای نەکردووە کەس قەڵسی کا . کەچەم ناوی (ماسوجو)ەو تەمەنی نۆزدە ساڵانە . کچێکی ڕوو هەڵماڵراوو مەشرەف خۆشـــــە ، بەڵام لەوەش دڵنیام کــە لــە ( تاکیهیکو ) بەولاوە شـــتاق پیاوی دیکەی نەناســـیوە . ڕوویەکی هێلکەیی بچووك ، ئەســـمەر ڕەنــگ ، خاڵێــك لەنزیك گۆشـــەوی چـاوی چەپیدابوو . دوێنێ ( تاکیهیکو ) لەگەڵ کچەکەمدا بەرەو ( واکاســا ) چوون ، ئای لەو بەخت ڕەشـــییە ! کــەبــەو شــێوەیەکی وا کۆتــایی هاتبێ .. کچەکــەم چی لێقەوماوە ؟ بۆ خاتری خوا ئەم ولاتە بۆکچەکــەم سەنگو سووژن کەن . ڕقم لــە ( تاجومارو )ی دزە . یان هەر چییەکی ناوە . هەر بۆ زاواکــەم نا ، بەڵام کچەکەم ( ئەم قسانەی دوایی لەگـــەڵ گریاندا تێکەڵ بوو ) .

## پاکانەی تاجومارو

کوشتم ! بەڵام ئافرەتەکە نا ، بۆکوێ چوو ؟ ناتوانم بیڵێم ، ئۆ ، دەقیقەیە چاوەڕێ کەن ، هیچ ئەشـــکەنجەیەك ناتوانێ پاکانەم بەشتێك پێبکا کەنایزانم . هیچتان لێ ناشارمەوە ، دوێنێ دوای

ئێواریێ ژنو مێردەکەم دین ، ( با ) یە هەڵی کرد ڕووپۆشەکەی لادا بەجۆرێ کەتوانیم دەمو چاوی ببینم ، دەستوبرد ڕووی لێشاردمەوە . لــە ( بودهیتافا )ی دەکرد . ئەودەمە دەمخواســـت دەستی بەسەردا بگرم ! ئەگەرچی بەکوشـــتنی مێردەکەشی تەواوبێ ! بۆچی ؟ کوشتن هێند گران نیە ! وەك ئێوە بیری لێدەکەنەوە . گــەر بتەوێ ئـافـرەتێکی ئـاواهیت وەگیـــر کــەوێ ! دەبێ مێردەکەی بکوژی ! بۆ کوشتنیش ئەو شـــیرە بەکار دێنم کەپێمە ! بۆ من یەکەم کەســم خەڵك دەکوژم ؟ تۆ شـــــیرەکەت بەکار ناهێنێ ؟ تۆش بەهۆی دەســـەڵاتو پارەتەوە خەڵك دەکوژی . جاری واش هەیە بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەیـــان کوژی ! خوێنیشـــــیان لێنایــەو تەندروستییان چاکە ! هەمووی وەك و یەکــــە ، تۆش دەیـــان کوژی ، ناتوانین بڵێین کێ تاوانە گــەورەکــــەی کردووە .

( پێکەنینێکی ڕقاوی ) بەڵام کارێکی پەسندە ئافرەتێــکی وات وەگیــر ، کــەوێو مێردەکــەی نەکوژی . ئاوا بڕیارم دادەســت بۆ ئافرەتــەکــە درێژکەمو پیاوەکەی نەکــوژم . بــەڵام کــاری وا لەڕێی (یاماشانا) ناکرێت . کارەکە زۆر هاسانە ! بوومە هاوڕێی ڕێگایان . پێم وتن لەوێ لەسەری شاخی بلندایەکی لێیەو هەڵم کەندووە ، ئاوێنەو شیری لێیە ئەو شتانەم لەبێســـتانێکی ئەو دیو چیای شاردۆتەوە بە هەرزانیشیان دەفرۆشم ..

بەتایبەتی یەکێك کە بییەوێن . پاشان وەك دەبینی مەگەر تەماعێکی مەترســـیدار نیە ؟ پێش ئەوەی شنەکان بزانێ قسەکانم کاری خۆیان کرد . لەنیو سەعات تێ نەپەڕیبوو ئەسپەکەیان لەگەڵ منـــدا بەرەو چیا دەنگدا . کە گەیشتینە لای بێستانەکە پێم وتن لێرە شاردراونەوە . داوام لێ کـــردن ببینن . کابرا هیچ سەرگری و بەرگری نەکرد . تەماع چاوی کوێر کردبوو ، ژنەکە وتی :

**ـــ من لەسەر ئەسپەکە چاوەڕوانم !**

دەبوو وابڵێ .. بێشەیەکی چڕوپڕی دی ، ڕاســتیت دەوێ پیلانەکەم وەك دەمویســـت وا دەڕۆیی . پێکەوە چووینە بێســــتانەکەو ئەویش مایەوە ، قامیشـــــەڵێن بوو ، لەدووری پەنجـا مەترێــکەوە کونێــکی داری ( ئــورز ) هــەبوو ،

ئەوکونە بۆمن چاك بوو ! کاتێ بەناو قامیشەڵێنەکەدا ڕێم دەبڕی درۆیەکی چاکم کرد ! وتم : گەنجینەکە لەژێر ئەو درەختانەدا حەشار دراوە . کەوام پێوت بەردو ئەو درەختی ( ئورز )ە چوو کە لە بێستانەکەدا دیار بوو ،

پاشان قامیشەکان تەنک بوونەوە . کەهاتین ڕیزێك داری ( ئورز ) دیار بوو ، لەپشتەوەڕا ڕامکێشا ، شیرێکی چاکی پێ بوو . زۆر بەتاقەت بوو بەڵام کەسی بە هاوارەوە نەدەهات دەستوبرد بەقەدی درەختێکەوە بەستمەوە ، بەڵام پەتم لەکوێ هێنا ؟ سوپاس بۆ ئاسمان من دزم ! پەتم پێ بوو چونکە هەر کاتێ بمویستایە بەهۆیەوە بە دیواراندا هەڵدەگەڕام .. زاریم ..

پڕ کرد لە گەڵا قامیشی وەریو نەکا دەنگی دەربێ ، کە لەو رزگار بووم چوومەکن خێزانەکەی و داوام لێ کرد بێ مێردەکەی ببینێ ، لەپڕ تێك چوو .

وەك بڵێی تووشی نەخۆشی هاتووە . پێویست ناکا بڵێم ئەم پیلانەشم سەری گرت ، ئافرەتەکە هات ، پەچەی لادابوو ، کە مێردەکەی وادی خەنجەرێکی چکۆلۆکەی پێبوو دەری هێنا ، قەتم ئافرەتی وا تووڕەو تۆسن نەدیبوو . ئەگەر زۆر وریا نەبام کەلەکەی کون دەکردم ، زۆری هەوڵدا ، لەوانەبوو برینداریم کا ، یان بمکوژێ بەڵام ( تاجومارو ) توانی چەقۆکەشی بخاو نەهێڵی شیرەکەم لێبکەوێ . زوربەی ئافرەتان ئاوان هەر ئەوەتا چەك کران ئیدی تێك دەشکێن و دوچن ! توانیم ئارەزووی خۆمی لەگەڵدا تەخت کەم ! بێ ئەوەی بهێڵم مێردەکەی بکوژرێ .

بەڵێ حەزم نەدەکرد بیکوژم . تەمام بوو هەڵێم و ئافرەتەکە بەگریاوی بەجێ بێڵم . بەڵام کاتێ خۆی پێوە هەڵڕۆسکاندم داوای ئەوەی دەکرد یان من یان مێردەکەی یەکمان بمرین . وتی: لە مردن ئەستەمتر ئەوەیە دوو پیاو ئاوا بیبینن. بەگوێدا چرپاندم دەیەوێ ژنی یەکێکمان بێ ئیدی ئەوی بە زیندوویی دەمێنێتەوە !

ئەوسا حەزم دەکرد بیکوژم ، کەوا دەڵێم وا دەنوێنێ کە لە تۆ ڕق ئەستوورترم ، بەڵام تۆ ڕووت نەدیبوو چاوە گریاوییەکانی ئەو دەمی ، کە چاویم دین حەزم کرد ژنم بێ ! تەنانەت ئەگەر لە ڕێگای دەست درێژ کردنیشەوە بێ ! ئەو بیرە مێشکی ئاخینم . هەر بیرکردنەوە نە بوو وەك تۆ بۆی دەچی ئەگەر هەر بۆ پێك گەیشتنێ بوایە پێویست نەبوو دوای کارەکە بمێنەوە . یان شیرەکەم خوێناوی کەم ، بەڵام لەو تاریکایی بێستانەدا کە سەیری چاوەکانیم کرد بڕیارمدا مێردەکەی بکوژم ، نەمدەخواست بەشێوەیەکی نا جوری بکوژم ، بۆیە لە دارەکەم کردەوەو وتم دەی : ( ئەو بەندی بە دارەکەوە بوو خستی ،

شیرەکەی زۆر بە توندیو تووڕەبیەوە دەرکێشا ، بێ ئەوەی هیچ بڵێ پەلاماری دام نامەوێ بڵێم شەڕەکە چۆن گۆڕا ، بیستو سێ جار شیر ڕاوەشاندن : تکایە ئەوەت لەبیر بێ . تا ئێستاش ئەو ڕاستەقینەیەم هیچ کەسێك لەم بەر خۆرە نەیتوانیوە بیست جار شیرم لەگەڵ ڕاوەشێنێ .

( پێکەنینێکی خۆش ) کاتێ کەوت بەشیری خوێناوییەوە بۆ لای ژنەکەی وەرچەرخام ، لەبەر شپرزەیی من ڕۆیبوو . لەناو داری ( ئورز )دا بۆی گەڕام ، هەستم ڕاگرت کرووزانەوەیەك دەهات ، دەبێ لەوکاتەدا ئێمە شەڕمان دەکرد ئەو هانای بۆ خەڵکی بردبێ ؟ کە بیرم لێکردەوە دیم کیشەکە بۆ من لە نێوانی مردنو ژیاندایە ئاوا ، شیرەکەو تیرو کەوانەکەی بردبوو ، بەرەو سەرڕێی شاخی ڕام کرد ، ئەسپەکەیم دی بەهێمنی وەستابوو . کات بە فیڕۆ دەدەم باسی ساتە کۆتاییەکانت بۆ بکەم بەڵام بەرلەوەی بگەمە شاری شیرەکەم لە کۆڵ خۆ کردەوە . ئەوە پاکانەی منە . دەزانم هەڵم دەواسن . سەرم دەبڕن ، بم خەنە ژێر ئازارێکی هەرەکوشندە .

## پاکانەی ئەو ئافرەتەی بۆ چاکی • ( سیمیزو ) هاتبوو

ئەو پیاوەی• حەریرێکی شینی لەبەر دابوو دوای ئەوەی ملکەچو شەرمەزاری کردم ، ڕوانیمە مێردەکەم کە بەسترابۆوەو بە تەوسەوە پێ دەکەنی . مێردەکەم چەند ترسێنەربوو ! گرنگ ئەوە نیە چەند تێکۆشا . پەتەکە بەستبوویەوە . بەرەو ڕووی چووم . ڕاستتر بڵێم دەمەویست بە ڕاکردن بڕۆم . پیاوەکە

ختمی رووناکییەکم لە چاوی مێردەکەمدا دی ناگێڕدرێتەوە . لەسەر رووی باس کردنەوەیە . چاوەکانی وایان کرد تائێستاش هەڵ لەرزم . نەیتوانی هیچ بڵێ ، ئەوەی لە دڵیدا بوو بە چاوان پێی وتم ئەوتیشکە نەتووڕەیی‌و نەخەم بوو تیشکێکی سارد بوو ، ڕوانینێکی پڕ تەوس ، لێدانی دزەکە بە بارتەقای ئەو سەیرکردنە نیگەرانی نەکردم هاوارم‌کردو کەوتم ، بێ‌هۆش بووم . کەوە هۆش خۆ هاتمەوە . کابرای جل‌شین نەمابوو . مێردەکەم هەر بەقەدی درەختی ( ئورز )ەوە بوو خۆ بەگرانی بەرزکردەوە، ڕوانیمە دەم‌و چاوی ، هەروەك پێشوو ڕقێکی ساردیان تێدابوون . لەناویانا خۆشەویستی .

شەرم ، خەم ، هەبوون پێم‌وت : (تاکیمرو) مادامەکی شتەکان ئاواهی کۆتاییان هات . ناتوانم لەگەڵ تۆدا بژیم . بڕیارم‌دا بمرم ، تۆش پێویستە نەمێنی ( عاری ) منت دی ! ناتوانم بە زیندوویی وەك خۆت بە جێت بێڵم .

ئەوە ئەوشتانەیە کە دەتوانم بیڵێم . بەر دەوام سەیری دەکردم ، بە جۆرێ تووڕەیی‌و بێزلێ بوونەوەی تێدا بوو . بە دڵشکاوییەوە لە شیرەکەی دەگەڕام . دەبێ دزەکە بردبێتی ؟ نە ؛ لەگەڵ تیرو کەوانەکەی لای بێستانەکە بوون .. بۆ شانس خەنجەرە بچکۆلانەکە لەناو قاچمدا کەوتبوو . بەرزم‌کردەوە ، وتم : ژیانتم بدەیە . وەدوات دەکەوم !

کە ئەو قسانەی گوێ لێ بوو ، بەگرانی لێوەکانی کردنەوە . دەنگی نە دەبیسترا چونکە زاری بەگەڵای قامیش ئاخنرابوو .. بەڵام من بەسەیر کردنێك تێی‌گەیشتم ، بەقینەوە دەیوت : بمکوژە ! با لە بەهۆشیدا یان لە بێ هۆشیدا بێ ، خەنجەرەکەم لەسینگی چەقاند ، جارێکی دیکەش بوورامەوە ، لەوکاتەدا وەهۆش خۆ هاتمەوە ویستم هەستم ئەویش لە دوا هەناسەکانی ژیانیدا بوو . رۆژ لە ناو درەختەکانەوە دەهات‌و خۆی لێ‌دەدا . تا رووناکتر بێتەوە ، پەتەکەم لەلەشی‌کردەوە.. نقومی هەناسە بڕکێ‌و فرمێسك بووم . چیم لێ‌هات ؟ کاتێك لە توانامدا نیە پێت ڕابگەیەنم ، گەرووی خۆم بڕی .. خۆم هەڵداشتە گۆمێکی خوار شاخەکەوە . ویستم هەرچۆنێ بێ خۆم لەبەین بەرم . تائێستا لەو بێ ئابڕوویەدا دەژیم ! نەمتوانی خۆ بکوژم ( ڕێکەنینێکی تەنیا ) بەزەیی هەڵناگرم مێردەکەم کوشت‌و دزەکەش ددستی بۆ درێژ کردم ، چیم لە دەست دێ بیکەم. چی ؟ ( هەناسەیەکی قووڵ ) .

## گێڕانەوەی چیرۆکی کابرای کوژرروا بەهۆی هۆبەکەوە

پاشی وەی دەست بۆ ژنەکەم درێژکرا ، دزەکە دەیدواند دەیویست هێمنی بکاتەوە . قسەم پێ نەدەکرا ، بەسترابوومەوە . چەند جارێ بۆم ڕوانی وەك ئەوەی بڵێم بە دزەکە بڕوا مەکە ، ویستم ئەوەی تێ گەیەنم ، بەڵام خەمبارانە لەسەر گەڵای قامیشان دانیشتبوو تەماشای باوەشی خۆی دەکرد . واپێ دەچی‌و گوێی بۆ قسەکانی دزەکە کلۆر کردبێ بە هۆی ( غیرە )وە ئازار دەدرام دزەکە ژیرانە بە بەردەوامی دەیدواند .. گەلێك ، باسی جیا جیای بۆ کردەوەو تا نیازە گڵاوەکەی کۆتایی : مادامەکی ئابڕووی تۆ لە کەدار بووەو ناشتوانی لەمەولا لەگەڵ مێردەکەتدا بمێنیتەوە بۆیە دەکرێ ئینجا ژنی من بی ! ئەو تووڕە بوونەشم هەر لە خۆشەویستیەوەیە .

لەو دەمەدا تاوانبارەکە دەدوا ژنەکەم سەری هەڵێنا وەك بڵێی ( تێماوە ) قەتم وەك ئەوکاتە بە جوانی نە هاتبووە بەر چاو . ژنە جوانەکەم چی وەڵام دایەوە ؟ منیش لەولاوە بەسترابوومەوە . ناتوانم بیر لەوەڵامەکەی بکەمەوە . مەگەر هەر بسووتێم‌و پەست بم‌و ( غیرە ) بمگرێ بەڕاستی وتی : بمبە ، بۆ جێیەکی دوور کە خۆت بەتەویای بچی . ئەوە هەموو هەڵەکەی نیە . ئەگەر هەر هێندە بایە وا دڵتەنگ نەدەبووم . لەتاریکیدا ، لە دەرەوەی بێستانەکە وەك لەخەوندا بێ دەستی لە دەستی دزەکەدا بوو ، لە پڕ ئاوڕێکی بۆ دواوە دابەوە . پەنجەی بۆ درێژکردم . بەدزەکەی وت : بیکوژە ، ناتوانم شووت پێ بکەم‌و ئەو زیندووبێ ! ( بیکوژە ) چەند جارێك هاوارم‌کرد ، واپێ دەچێ شێت بووبێ ! تا ئێستاش ئەو وشە ڕەق‌و تەقانە هەر وەدووم دەکەون لە تاریکیشدا کۆڵم لێ نادەن ! ئایا شتی وا لەزاری کەس ڕاهاتۆتە دەرێ ؟ ئایا هیچ گوێیەك وشەی ئاوا هی بیستووە

( هاوارێکی ڕقاوی لەپڕ ) دزەکە بەو وشـــانە شـێوا . هاواری‌کرد بیکوژە خۆ قۆڵـــەکـــانی بەستراوەتەوە ! دزە بە ( نە ) یان ( بەڵێ ) وەڵامی دایەوەو بە تووڕەییەوە ســـەیری‌کرد . بەگرانی ببرم لێ کردەوە ، پێش ئەوەی لەناو قامیشەکاندا بکەوێ ( هاوارێکی ڕقـاوی دیکە ) بەبێ دەنـگ سـەیری‌کردم . چی لێ دەکـەی دەیکوژی یـــان ئازادی دەکەی ؟ دەبێ ســـەرنج دەی . بیکوژە ! لەبەر ئەو چەند وشانە دەمەوێ لە تاوانەکـــەی خـۆش بم ، مـن دوو دڵ بووم ، چـــووە نـــاو بێستانەکەوە ، دزەکەش بەدوایدا ، بـەڵام بـۆی نەگیرا . دوای هەڵاتنی شیرو تیرو کەوا نەکەمی هەڵگرتن‌و قەیدەکانی پـساندن چارەنووس ئاوایە .

پاشان لەناو بێستانەکەدا ون بوو . ئیدی هەموو شتێك خامۆش . دەنگی گریانی کەسێ دەهات ، بەسترابوومەوە ! گوێم بە چاکی ڕاداشـــــت ، هەستم کرد گریانی خۆمە ( بێدەنگییەکی درێژ ) لاشەکەم بەرزکردەوە ئەو شیرەی خێزانم فرێی‌دا لەبەر دەممەوەبوو . هەڵم گرت‌وکردم بەسـنگی خۆمدا ، کڵۆ خوێن هاتە زارمەوە هەستم بە چ ئێشێك نەکرد . لەوکاتەدا ســـنگم سارد بۆوە هەمووشتێ بێ دەنگ لەمردووی نـاو گۆرستانی دەکـــرد .. بێ دەنگییەکی چـەنـد خۆش بوو ، دەنگ‌و ئاوازی چۆلەکەیەکی ناو شاخی نەدە هات کـــە لـــە ئاســـمانی گۆرەکە بخوێنێ ، تەنیا ڕووناکییەك لەسەر درەختی ( ئورز )ەوە لەســەر شاخی ڕا پرشنگی دەدا ، وردە وردە کـەم بۆوە تا ، نەما . درەختەکانیش هەروەها ، لەوێ فرێ درابووم، بێ دەنگییەکی ئەستوور دەوری‌دا بووم، یەکێك هاتەلام ویستم ببینم . تاریکی گەمارۆی دا بووم.. دەستێك بەنهێنی خەنجەرە چکۆلەکەی لەســـنگم هێنایە دەر خوێن لە زارم دەرپەڕی . ئیتر بۆ هەمیشە لەناو بۆ شـایی تاریکیدا نقـوم بـووم !

* * *

**سەرنج : ئەم چیرۆکە لەگۆڤاری ( المعرفة ) وەرگیراوە ژمارە ( ٢١٩ ) مایســـی ١٩٨٠ دا بلاوکراوەتەوە .**

**پێناســـین :**

دوا بەدوای ئەوەی ئەم چیرۆکەم خوێندەوە حەزم کرد پێی‌دا بچمەوەو وردتر زەینی دەمێ .. نەخێر قنیاتم بەوەش نەهات کەلکەلەی ئەوە کەوتە سەرمەوە بیکەمە کوردی لەبەر ئەم هۆیانە .

**١ – شێوەی چیرۆکەکە : وەك لە خوێندنەوەدا دەروەکـــەوێ هەرگێڕانەوەیە بەڵام ئـەو گێڕانەوە ساردو سڕەنا ، بێ وازت کا .. بەڵکو ئەوانـــەی کە ئاگاداری تاوانەکـــەن حەزدەکەی زووزوو قسە بۆ قومیســـەر بکەن‌و بگەیـــە ئەنجـــام .. چیرۆکنووس لـــە چەنـد دێـڕێکی کـەم بـەولاوە خـۆی لە کاروباری پاڵەوانەکانی هەڵناقورتێنێ .. ئەم باس‌و خواسانە بە زمانێکی ســـفت‌و شیرین وتراون ، بـە جورێکی زۆر تونـدو تۆڵ ڕســـــتەکان پێکەوەگـــرێ دراون‌و وەســــتایانە لەشـــوێنی خۆیدا دانراون ، لابردنی دێڕێك مەبەستەکە کەل دەکـــاو ســـــاختمانی چیرۆکەکە پێیەوە دیارە .. وەســــف هەر دەبێ وابێ ، مردن هەروا پێشوازی دەکرێ .. تاریکایی بێ ســنوور چەند بێ‌ئامانە ، لەڕاستیدا ئیسترامێ تێدا نەکـراوە وەك ئـەوە زۆر جار لـەچیرۆکی کۆریدا دەبیینین ، نیوەی لا بەهەســـــت بەوە ناکەی شتێك ڕووی داوە ..**

**٢ – لە ڕووی ناوەرۆکەوە : تاوانێك کراوە .. تەماع و فێڵ ڕۆڵی ســــــەرەکی تێـدا دەگێـڕن . ( با ) دەبێتە ڕێکەوتێکی هێنـد سەیر ئەوکەتنەی لەدوا خۆی بەجێ‌هێشت .. ( تاجومارو ) بە هۆی ( بـا ) وە رووی ئـافـرەتێـك دەبینێ‌و گیـــرۆدەی دەبێ ، دەیەوێ بەهەر نرخێك بێ دەســتی کەوێ‌و دەســـت خۆشی دەخا ، هـــەر بۆ لەگەڵ ڕاکشانێك ! ئەویش لـــە کاتێکا کەمێردی ژنەکەش بە دارێکەوە بەستراوەتەوەو چاوی لێیەتی ! دووکەس شوورەیی ژنێك دەبینن .. ژنـە دەیـەوێ خـۆی بکوژێ ئـەوەی لەدەست نایە ، لەگـەڵ ئەوەدا کەهەمولیش دەدا ، مێردەکـــەی دەکوژێ ، بەدەم ئـەو ئـازارە نەفســـــییەوە دەمێنێتـــەوە . ( تاجومارو )ی هەوەسبازیش وەك بەرزەکی بـانـان بـۆی دەردەچێ . بـەڵام پـۆلیس دەیگرێ ....**

■ محمەدعلی قەرەداغی

# چەند سەرنجێکی پێویست

**راستیەك هەیە هەركەسێ بە شیعرو كەلەپووری ئەدەبی كوردیەوە خەریك بێ زۆر لای روونەو نابێ كاك ( جەمال )یش ئەمە پشتگوێ بخات ، ئەو راستیەیش ئەوەیە : هیچ نووسەرێكی كورد نیە بیەوێ دەربارەی بەرهەمی شاعیرێكی كلاسیكی كورد شتێ بنووسێو بتوانێ هەرچی دەربارەی ئەو شاعیرەو بەرهەمەكانی نووسراوە بیزانێو دەستی پێبدابكات ، چونكە دەبێ هەر لە ( كوردستان ) ـ یەكەم رۆژنامەی كوردی ـ یەوە تا بەیانو ، رۆشنبیری نوێو ، عیراقو ، هاوكاریو ... تاد بە هەموویاندا بگەرێ كە ئەمەیش لە تواناداا نیە ، چونكە گەلێ لەو گۆڤارو رۆژنامانەمان لەناوچوونو هەندێكیشیان ، لەبەر كەمی ژمارەو دوورە دەستی ، لە نرخی نەبوودان .**

من دەمێكە هەستم بەمە كردوەو لە لای خۆمەوە سووكە ئەرشیفێكم بۆ ژینو گەلاوێژو دەنگی گێتی تازەو ... بەیانو رۆشنبیری نوێو عیراقو ... تاد كردوەو لە هەوڵی فراوانكردنیشدامو ئەم تەنگو چەڵەمەو رێگەی چارەسەریم لە هاوكاریدا نووسیوە[1] .

لێرەوە دەچمە ناو باسێك دەربارەی ئەو وتارە كە كاك جەمال محەمەد ئەمین لە ژمارە (٦٤)ی گۆڤاری ( بەیان )دا لەسەر وتارێكی من نووسیبووی كە لە ژمارە (٦٢)ی هەمان گۆڤاردا بڵاو بووبوەوە .

لە پێشدا لە كورتی ئەوەندە دەڵێم : ئەو هەموو نووسینەی كاك جەمال لە دەوری دوو دێردا دەخولێتەوە كە دەكرا لە بری ئەو وتارە ئەو دوو دێرەی بناردایەو لە كورتی ببڕایەتەوە ، دوو دێرەكەیش ئەوەیە :

**كاك جەمال ـ ئەگەر راست بكات ـ[2] ، وەك خۆی دەڵێ ، لە رۆژنامەی هاوكاریدا ـ بەڵام بە داخەوە ئەو ژمارەی رۆژنامەكەی**

**نەمـاوەو لە یادیشی نەمـاوە چ ژمارەکەیە ٩ ـ پارچەیەك شـیعری بە ناوی ( فکری )یەوە بلاوکردوەتەوەو من ئەو پارچە شیعرەم بـە ناوی ( نالی )یەوە بلاوکردوەتەوەو باسی ئەوەی کـاك جەمالم نەکردوە .**

بەلاَم کاك جەمال درێژەی بە باسـەکەی داوەو داویەتیە زۆر بەرەوژوورکەو لاپێی وا کـە پێی هەلَخلیسکاوەو خۆگرتنەوەی ئاسـان نیە . من لـە هەموو ئەو لایەنانە نادوێمو بـە یەك دوو لایەن دەسبەردار دەبم .

کاك جەمال لە وتارەکەیدا باسی ئەکادیمیەت دەکاتو داوای ئەکادیمیەت لە من دەکا . جا بـا بزانین کاك جەمال خۆی لەم وتارەدا ئەکادیمیەتی دەگاتە چ رادەیەك ؟ چونکە بێگومان ئەگـەر یەکێ ئامۆژگاری یەکێ بکات بە کردنی ئیشێکو خۆیشی ئەو ئیشـە نەبا بەرێوە نەکردنی ئامۆژگـاریەکـەی گەلێ باشترە . کاك جەمال لە چوار پارچە لـەو شـیعرانە بـە دەنگ هـاتوە کـە من بلاوم کردوونەتەوە :

**١ ـ شەوی یەلدایە یا دەیجوورە ئیمشەو :**

ئەوەی کاك جەمال لەسـەر ئەم پارچە شیعرەی نووسیوە لە دەوری هەندێ قسـەی د. مارف خەزنەداردا دەخولێتەوە کە من ماوەیەکی زۆرە وەلاَمی ئەو قسانەم داوەتەوەو[3] ئەگـەر سـەیری رێبازی ئەکادیمی بکەین نەدەبو کـاك جەمال بەو جۆرە لەسەر ئەو بابەتە بێتەدەنگ .

**٢ ـ رەفیقان ! من ئەوا رۆییم لەلاتان :**

دەربارەی ئەم پارچە شیعرە جاری پێشوو گوتم : زۆری لەسـەر نووسراوەو هەلَناگرێ زیاتری لەسـەر بنووسرێ . بەلاَم لێرەدا کـاك جەمـال ناچاری کردم بگەرێمەوە سـەری . ئەم پارچە شـیعرە بێجگە لەوەی لـە چاپەکانی دیوانی نالیو کوردیدا بلاوکراوەتـەوە پێش کـاك جەمـال سێ جـاری دیـکە بلاوکراوەتـەوە[4] ، بەلاَم کاك جەمال یان ئاگای لێیان نیە یـان خۆی لێلاداون . کەچی هاتوە رەپو راسـت بێ هیچ زیادە مەبەسـتێكو بێ هیچ روونکردنەوەیەکی بەسوود جارێکی دیکە بلاوی کردوەتەوە ، لەگەلَ ئەوەیشـدا کە هەر ئەم جارەی دوایی من بلاوم کردوەتـەوە (١٤) بەیتـەو بەیتێکی لەوەی کـاك جەمال زیاترەو جگە لە هەندێ پاشوپێش لە دوو سێ بەیتی دوایدا جیاوازیـەکی ئەوتۆیان لـە نێواندا نیە . جا ئایـا ئـەو ئەکادیمیەتـەی کـاك جەمال باسی دەکاو داوای دەکا لە خەلَك داوا لەو ناکات کە باسی سەرچاوەکانی پێش خۆی بکات ؟ ئایـا ئەکادیمیەت دژی جوینەوەو نووسـینی بێ کەلَكو بێنوێکردنەوە نیە ؟ ئایا نەدەکرا تەنهـا باسی پاشو پێشو کەمو زیادی نێوان پارچەکـان بکاتو بەس ؟

**٣ ـ چێشـتم ( ئەمرۆ ) زەهری مارو رۆحی شیرینم نەهات**
**زەخمی ( کۆنەم ) هاتـەژانو مـەرهـەمی برینم نەهات**

جارێ من ( ئەمرۆ )م نەنووسـیوەو ( ئەمشەو )م نووسیوەو هەندێکیش لەسەر ئەوە دواوم کە ( ئەمشەو ) . لەو جێگەیدا ، لە ئەمرۆ پەسەندترە ، هەروەها ( کۆنەم ) نەنووسـیوەو ( کوهنەم ) نووسـیوە بەلاَم ئەکادیمیەتی کاك جەمـال بێ ئـەوەی نقـەی لە دەم دەربێت بـەو جۆرەی گۆریوت .

دوایش بلاوکردنەوەی پارچەکە بەو شێوە هیچ پێویسـتی نەدەکردو ئەگەر لێی بێدەنگ بوایە ، گەلێ باشتری دەکردو کەمتر شیعرەکانی دەشێواند ( بە جیا باسی شـێواندنەکە دەکەین ) خۆ ئەوەی لە ( دیوانی کوردی )دا بلاوکراوەتەوە ـ جگە لەوەی خوا لێخۆشبو گیوی موکریـانی هەندێ وشەی گۆریوە ـ زۆر لەوە رێكو پاکترە کـە کاك جەمال بلاوی کردوەتەوە ئیتر ئەم دوو سێ هێنـە کردنە بۆچیو ؟ دەبێ ئەمـە چ جۆرە ئەکادیمیەتێکی تازە بێت ؟

**٤ ـ ئەی رەفیقانی طەریقەت دەردی عیشـقم چارەکەن :**

کاك جەمال ، وەك وتمان ئەگەر راسـت بکات ، ئەلێ ئەم پێنج خشتەکیەم لە (هاوکاری)دا بلاوکردوەتەوە ، جا کەوایە چ پێویسـت دەکـا جارێکی دیکە بێت لێرەدا بەو شێواویو وێرانیـە بلاوی بکاتەوە ؟ دەبێ ئەکادیمیەت وا بلێ ؟! یـان ئەم جۆرە کارانە بریتین لـە لاپـەرە پرکردنەوەو ( وتار ! ) بلاوکردنەوە !

ئەوەی ئـەکادیمیەت لە نووسەری دەوێ ئەوەیە بە ئەمـانەتو وردەکارو بە توانـا بێتو تواناکەی بە شتێکدا نەشکا خۆی لە قەرەی نەدات . بە خوێندنەوەیەکی خێرای شـیعرەکان بۆمان دەردەکەوێ کاك جەمال سواری ئەو مەیدانە نیەو ئەوەتا گلاوەو گۆی هونەری نەبردوەتەوە .

جا با پێکەوە بە خێرایی بەســــەر هەندێ جێگەی شیعرەکاندا بڕۆین .

وا دەردەکەوێ بۆ پارچەی ( عەزیزان !.. ) کاك جەمال سوودی لە چاپەکان وەرگرتوەو ئـەم پارچە هەڵەی کەمە بۆیە لە پارچەی ( چێشـــتم ئەمڕۆ ... ) وە دەست پێدەکەین .

نیوەی دووەمی بەیتی دووەم (ڕۆیوە) هەڵەیەو کێشی شیعرەکە نارواتو دەبێ بگوترێ ( ڕۆییوە ) بەدوو ( ی ) .

بەشی یەکەمی بەیتی پێنجەم ( دەگەڕێنێ ) هیچ مانایەك نابەخشێتو نەمزانی چۆنـە ، بەڵام لە دیوانی کوردیدا ( دەبارێنێ )یە .

نیوەی یەکەمی بەیتی شەشەم ( چوکـانی ) هەڵەیەو ( چەوگانی ) ڕاستە . دیارە کاك جەمال باسی ( گۆ )و ( چەوگانی ) نەبیستوە !

نیوەی دووەمی بەیتی شەشەم ( شـەهسوار خانەی ) بەو شـــێوە بەیتەکە لەنگ دەبێو دەبێ ( شەهسـواری خانەیی ) بێت .

نیوەی یەکەمی بەیتی حەوتەم ناتەواوەو لە کۆتاییەوە ( غـەرغـەرە )یەك بـوێـرراوەو لـــە ناوەڕاستدا ( هەم )ێکی بۆ هێنراوەو تەواویەکەی بەم جۆرەیە : ( کەوتمە ناڵەی نەزعەوە ، غـــەم خـستمیە حاڵی غەرغەرە ) .

پارچە پێنجخشتەکیەکە کە کاك جەمال دوو جاری بڵاوکردوەتەوە ( چونکە پێنج خشـــتەکیە هەر لە ســــەرەتاکەیەوە ژمارەی دێڕەکـان بـە ددستەوە دەگرین ) .

دێڕی پێنجەم : ( یا بـە خەنجـەر بمکوژن جەرگم بە خەنجەر پارەکەن ) ئەمــە کاری کـردە بیەو شاعیر لە یەك نیوە شیعردا دوو جار وشەی ( خەنجەر ) بێ مەبەستێکی جوانو مانایەکی نوێو ناســـك ناڵێتەوە ، بەڵکو ڕاست وایە وەك لـــە دەســـخەتەکەی قزلجیو دیوانی کوردیدایە بـەم جۆرە بێت : ( یا بـە جارێ بمکوژن جـەرگم بـە خەنجەر پارەکەن ) .

دێڕی شــەشـــەم « یارەبی چی بکەم لە ( دەســـتی ) جـەوری ( ڕەقیب ) بەدزوبـان » ئەمەیش هەڵەیەو شـیعرەکەی کەچ کردوەو دەبێ بەم جۆرە بێت : « یا ڕەبی چی بکەم لە (دەست) جەوری ( ڕەقیبی ) بەدزوبان » .

دێڕی هەشتەم ( ناڵی بم ) نازانم مەبەست چیەو مانای بەیتەکە ڕوون نیە .

کاك جەمال لە خوێندنەوەی دێـڕی ( ١١ ، ١٢ ، ١٣ ، ١٤ ) دا کەوتوەتە کۆمـــەڵێ هەڵەی زەقو ئاشکراوەو بەڵگەی ئەوەن نـە کێشو نـە مانای شیعرەکانی نەزانیوە کە لـە کۆتاییەکانیاندا نووســــیویە ( ناڵمە ) . ( تاڵمە ) ، ( ناڵمە ) ، ( ســاڵمە ) ڕاستیەکانیان ( ناڵەمە ) ، ( تاڵەمە ) ... تاد ، بۆ ئەوەی تۆزێ باشتر ڕوونی بکەینەوە دەڵێین :

کاك جەمال نووسیویە :

**( من لە مەستی چاوی ( مەسـتیت ) ڕۆژو شەو هەر ناڵمە )**

جارێ ( مەستیت ) جوان نیەو ( مەستت ) پڕ بـە پێســتی جێگەکەیە . ( ناڵمە ) ، ( نـاڵ ) لێرەدا جگە لە ( ناڵ ! )ی سمی ئەسـپو ماینو کەرو ... چ مانـایـەك نابەخشێو ئـەو مانایش لێـرەدا ناگونجێو هـەر دەبێ ( ناڵـە ) بێ کـــە مەبەست هاوارو ناڵەو فوغانە .

**( تۆ نیە ڕەحمت بە حاڵم چونکە نەحسی تاڵمە )**

کورد نـاڵێ : ( نەحس تـاڵ ) یان ( بەخت تاڵ ) بەڵکو دەڵێ : ( بەدبەخت ) و ( چارە ڕەش ) و ( نەحس طالع ) تاڵەی ( تاڵم )ی کاك جەمـال لـە ( طالع )ی عـەرەبیـەوە هـاتوەو دەبێ لـە دەسخەتەکەیشدا بە ( ط ) نووسرابێ نەك ( ت )و کاك جەمال چونکە مەبەستی نەپێکاوە وای بەباش زانیوە ( ط )ەکە بگۆڕێ بە ( ت ) . مەولەوی نەمر لەم ماناادا دەڵێ :

**مشیۆ ( تاڵە )ی من خیلاف ئەنگێز بۆ**

وەرنـە کەی ، کێ دی ، وەهـار گوڵڕێـز بۆ ؟! (٥) ئاشـــکرایە دەبێ بەو پێیە دێڕەکـــانی ( ١٣ ، ١٤ )ش ( ناڵە )و ( ساڵە ) بن . هەر لـــە دێڕی (١٣)دا کـــە دەڵێ : ( ڕازیم ئـەمن بـە فیرقەتو ) ناتەوایەك هەیـەو دەبێ ( ... ئەمن « بەم » ... ) بێت .

دێڕەکانی (٢٩) و (٣٠)ش بەڵگەیەکی دیکەی ڕوونی ئەوەن کە کاك جەمال بەلای ڕاستی مانای شـــــیعرەکاندا نەچوەو لە خۆیەوە ڕوونووسی کردوون . کاك جەمال نووسیویە :

**لەت لەتە جەرگم دەڵێن چاوی پڕکردوومەوە**

**خوێن بە خوڕ نایە مەگەر جۆماڵی ئەو جوتیارەکەن**

شاعیر مەبەستی ئەوەیە بڵێ : پارچە پارچەو لەت لەتی جەرگم ( دەڵێن ) یان ( دەڵێنی ) – کە مەبەستی جۆگەی دەڵێنی شارەزوور بێ – چاوی پڕکردوومەتەوە ، کە جۆگەیش پڕبوەوە ئاوەکەی – خوێنەکەی – پەنگ دەخواتەوەو ئاوی بەخوڕ

نایە مەگەر ئەو جۆگە جۆماڵ بکرێ . کەواتە لێرەدا ( لەت لەتە ) هەڵەیەو دەبێ ( لەت لەتی ) بێو رەنگیشە ( دەڵین – دەڵێن ) نەبێو (دەڵێن ) بێ کە جۆگەیەکی بەناوبانگە . هەروەها ( جوتیار )یش هەڵەیەو راستیەکەی (جۆیبار)ەو ( جۆیبار ) جۆگەیە .

دێڕی ( ٣٥ ) – دوا دێڕ – ( زەحمەت نابێ )یش هەڵەیەکی دیکەی نەشارەزایی کێشی شیعرو نەزانینی مەبەستی شیعرەو دەبێ ( زەحمەتە نابێ ) بێت .

**زیاد لەمانەیش کاك جەمال لە دەقی شیعرەکاندا خۆی لە ( . ، ؛ ؟ ! : – – « » [ ] ) نوختەو وێرگولو ئەداتی پرسیارو سەرسوڕمانو... تاد دزیوەتەوەو بەمەیش زیاتر گومان لە عاستی زانینی ماناى شیعرەکاندا پەیدا دەبێتو گومان بۆ ئەوە دەچێت نەبوێرابێ خۆی لەو بوارە بدات ؛ چونکە دانانی ئەو ئەداتانە لەلایەکەوە یارمەتی خوێنەر دەدات بۆ باش خوێندنەوەو تێگەیشتن لە ماناى نووسراوەکەو لە لایەکی دیکەیشەوە رادەی تێگەیشتنی نووسەر خۆی لە دەقەکەدا دەردەخا .**

جگە لەمانەو لەوانەیش چەند شتی دیکەیش هەیە بەسەریانا رابوردین بەڵکو هەڵەی چاپ بنو هەڵەی ئەکادیمی نەبن .

نموونەیەکی زۆر روونی دیکەی نائەکادیمی کاك جەمال هەیە نامەوێ بەسەریا بڕۆم ، ئەویش ئەوەیە :

**کاك جەمال لەو هەموو وشە جۆراوجۆرە دیاریو نادیاری ناو شیعرانەدا ماناى سێ وشەی لێداوەتەوە ، لەوانەیشدا سێیەمیان کە دەڵێ : ( جۆماڵ : پاکردنەوەی جۆگەلەی ئاوی گەورە یان بناوانە ) لە دوو لاوە هەڵەیە . یەکەم : کە گوترا ( جۆگەلە ) ئیتر ( گەورە ) زیادەو بێ جێیە ؛ چونکە ( ەلە ) لە کوردیدا ئەداتی ( تصـغیر – بچووککردنەوە )یەو وای لێدێ کە بڵێ : ( جۆگە بچووکە گەورەکە ! ) . دوەم : ( جۆماڵ ) ناوی خۆی بەخۆیەوەیەو واتە : ( جۆگەماڵینو پاککردنەوە ) ئەمەیش بۆ ( بناوان ) دەست نادات و بۆ ( بیرو ، بناوانو ، گۆمو ، ئەستێل ... ) ، ( دەردان ) دەوترێ نەك ( جۆماڵ ) .**

**سەرچاوەو پەراوێزەکان :**

١ – بڕوانە : هاوکاری ژمارە : (٤٩٦) رۆژی ١٥–١٠–١٩٧٩

٢ – بۆیە دەڵێم : ( ئەگەر راست بکات ) چونکە چۆن دەبێ نووسەری ئەکادیمی نەچێتەوە سەر وتاری خۆیو ! نەزانێ کەیو لە کوێدا بڵاوی کردوەتەوە ؟

٣ – بڕوانە : رۆشنبیری نوێ ژمارە : ٥٠ ، حوزەیرانی ١٩٧٦ ، نالی بۆ شیعری وا نالێ ؟

٤ – بۆ جاری یەکەم بڕوانە سەرچاوەی پێشو کە بە ناوی ( محمود )ەوە بڵاوکراوەتەوە . بۆ جاری دوەم بڕوانە : عوسمان هەورامی ، هۆنراوەی عەزیزان من ئەوا رۆییم لەلاتان خاوەنێکی کەی هەیە ، ژمارە : (٤) سالی (٣) ، ١٩٧٩ .

بۆ جاری سێیەمیش بڕوانە بەیانی (٦٢) کە کاك جەمال لەسەری رۆیشتوە .

٥ – بڕوانە : مەلا عبدالکریمی مدرس ، دیوانی مەولەوی ، بەغدا ، چاپخانەی ( النجاح ) ، ١٣٨٠هـ ١٩٦١م . پارچەی ( ٢٢ ) تیپی ( ئەلف ) .

— دیوانی کوردی چاپی سێیەمین ، چاپخانەی کوردستان ، هەولێر ، ٢٥٨٣ی کوردی – ١٩٧٣ی بوونی .

شـــێرزاد

# سەماوس

دیسانەوە ..
ئەی کۆترە خنجیلانەکەی بەر دڵم ..
هاتیتەوە بەر سێبەری هەیوانی مزگەوتی خەون‌و
خوام ؟!
تۆ ئەی ئەو ڕوبارە خوێنەی مەلەی تیا ئەکەم
تۆ چ شاخێکی خەمی‌و لەسەر کۆڵم هەڵمگرتووی.
ماندوو نابم !
مەڕوانە هێمنیم ..
من ئەو دەریا بێ‌گێژدنەیە نیم خۆشت ئەوەێ ..
وەرە بزانە .. چ دارستانێکی مەزن لە مێشـــکما
ئەسوتێ !

تۆ بۆ ئەو هەموو باڵندە لانەوازانەی خۆت ..
ڕەوانی ئەم دارستانە کرد ؟
وەرە ئاسمانی خۆتیان بۆ بکەوە
نە سەهۆڵی ناو دەمارەکانت توایەوە
وەکو زولف‌و کەزیەکانت ڕاکشان‌و خاو بوونەوە..
هەستەوە .. سەمایەکی شێتانەم بۆ بکە ....
نیتر گیانە ..

عەشق چی‌یە .. دونیا چی‌یە ؟
تەنیا سەماو سوتانێکە !
تۆ تیشکی خۆر نیت ..
بەیانیان خەڵکی کە چاویان هەڵدێنن ..
ڕوناکی خۆر دەپرژێتە چاویانەوە ..
کەچی بارانی خەمە خۆشـــەکەی تۆ .. بەرایی
لافاوی هەتاو دەگرێ ..

حەسەن

# ـــووتـــان

دەبارێتە چاوەکانم
پێش تیشکی خۆر .. دەپڕژێتە ناو چاوانم !
تۆ دەباریو .. هەر دەباریو هەر دەباری ..
ڕەشـــەبای شارەکەشـــت .. هیچ چەترێکی
پێنەهێشتووم

تۆ چۆن توانیت ..
هەم چەتر بیتو هەم باران ؟!
تۆ ئەو دەنکە گەنمە بەجێماوەی ماڵە هەژارێکی..
مێروولە سوورەکانی گیانم .. دەورت ئەدەن ..
بۆنت ئەکەن ..

ئاخۆ ئەتوانن هەڵتبگرن .. ؟
منو تۆ .. دوو تۆوڵە ڕێی باریکی خەمێکین ..
لە دووڕیانێکدا بووین بەخەمی شارێگەیەك
من ئەترسم .. چۆن نەترسم
منی لاتو دارکێشی ئەم شاخانە ..
تۆم دۆزیەوە ... ؟

چۆن بتوانم لە هەزاران برسیو چەتەو ڕێگرەکان..
بتشارمەوە .. ؟
بەد بەختیە .. بەد بەختیش نیە ..
لەم قاتوقڕیو نەهاتیە .. لەم برسیەتیە ...
تۆم دۆزیەوە ..
ئەی کۆترە خنجیلانەکەی بەردلم ! ...

★

# شاعیرێکی نەناسراوی دەشتی گەرمیان

هەردەوێڵ ک

ئەو زانا بەرزە ئاین پەروەرەو دەنگ خۆشە ، ئەو دەروون بێ گەردەی بیر تێژە ، خاوەنی شیعری خۆش خۆشی هەورامانی .

**سەید ( عەباس حیلمی کاکەیی )یە**

١ ـ عەباس کوڕی سەید وەلەد کوڕی سەید وەلی‌یە لەنەوەی میری سوورە لەبنە ماڵەی بەرزنجەیە . دایکی ناوی ( لەیلێ )یە کچی سەید حەسەن سەید (مەجلیوم)ـە لەساڵی ١٨٩٤ی (ز) چاوی هەڵهێناوەو هاتووەتە ڕوی جیهانەوە ، لەشاری کەرکووك چووەتە حوجرە لای مەلا زەینەڵو مەلا فەتۆش‌و میرزا خەلیل منوودەر خوێندنی تەواو کردووەو ئیجازەی وەرگرتووە .

٢ ـ زانایەکی ئاین پەروەرو شاعیرێکی سینە ساف‌و بیر تێژ بووەو هەمیشە ڕوخۆش‌و قسەخۆش بووەو زۆریش دەست کورت‌و هەژار بووەو بەشکارنە کێڵی ماڵو منداڵەکانی بەخێو کردوە ، لە دەورو بەری ساڵی ١٩٢٥ی ز دا ژنی خواستووە ، ژنەکەی ناوی ( عەمەر )ە کچی سەید ( قەلەندەر )ەو دوو کوڕی لە پاش بەجێ ماوەو ئەوانیش ( موبارەك )و ( قودرەت )ن.

ـ شاعیر نازناوی ( حیلمی ) بۆ خۆی داناوەو جار جاریش بەناوی مەلاوە شیعری وتووە جار جاریش بەناوە ڕاستەوخۆکەی خۆیەوە . ئەتوانم بڵێم هۆنراوەکانی دەبن بەچوار بەشەوە ئامۆژگاری ، سۆفیگەریەتی گەلی ، گاڵتەوگەپ .. شیعرەکانی بەهەموو ناوچەی کاکەییەك بڵاو بوونەتەوەو پیاوو ژن زۆربەی شیعرەکانی لەسینە کردووەو من کەشکۆلێکی دەست نووسی خۆیم لای دۆستێکی دەستکەوت بەدەیان پارچە شیعری هەمەجۆری شاعیری تێدایە .

لەم گوندو ناوچانە ژیاوە گوندی ( تۆبزاوەو عەلی سەرای و زەنقڕو عەرەب کۆیی و مەتیق ئەم گوندانە سەر بە داقوقن .

٤ ـ لە سالی ( ١٩٥٩ )ی ز تووشی نەخۆشی ( ئیفلیجی ) بووەو چاك نەبۆتەوە تا ڕۆژی ١٩٦٦/٦/٧ی ز ئەمری یەزدانی بەجێ هێناو کۆچی دوایی کردو لە گۆڕستانی ( حەواشەکان ) لەدێی عەلی سەرای نێژراوە .

**ئەمیش چەند نموونەیەکە**
**لە شیعرەکانی شاعیر**

— ١ —

فەقیە ناڕاسەن فەقیە ناڕاسەن
فرقەی مونکران تەمام ناڕاسەن

مەشهوری نامم مەلا عەباسەن
ئەرصەد خەراو بۆ هەرخاسی خاسەن

— ٢ —

بەدێ مەکەردێ بگێردی ڕای ڕاس
پاریز بکەردێ دڵتان جە وەسواس
مەگێدێ وەشۆن حەرف بێ ئەساس
کینەکێش مەودێ بە وێنەی بلباس
گەوهەر بێقیمەت بازاڕم کەساس
صەد دادم جە دەست گرۆی حەقنەناس
قسەشان وێنەی خەدەنگو ڕەساس
ئەی برادەران جە گیان بیم هەراس

مەبۆ بپۆشی قەطران لیباس
وێڵبی نەشاران چون گەدای ئیفلاس
جێشتانەن چەنی هامسایان خاس
غەیبەتشان مەکەن وە چەپو وە ڕاس
وە فسقو فاسق وەس بکەردێ باس
هەی داد هەی بێداد جەرگم بی پەلاس
پەردە مەدڕی بە وێنەی کرباس
بە واتەی مەلای زومرەی گرۆی کاس
بێزارەن جە دەست مەخلوق ناڕاس

— ٣ —

برادەرێکی دڵسۆزی ناوی ( محەمەد دەروێش عەلی )ە تا ئەم سەردەمەیش ماوە نامەی لێ دەبڕێتو وەبۆ ماوەیەکی زۆر سەری لێنادات ئەویش نامەیەکی بۆدەنێری بەشێوەی شیعر گلەیی خۆی دەکاتو لەپاشا بەمردوی دادەنێتو شیوەنێکی بۆساز دەکاتو ئەمیش دەقی نامەکەیە :

گاك حاجی دیار . . . . . . . . .
یە چەندێ وەختەن نیەنی دیار
خەیلێوەن چەمم نەکەفتەن وە یار
پەڕوباڵ سوختە چون پەروانەی یار
مەشغول مەعیشەت لێمانبیت بێزار
پەرێ دیدارت هام جە ئینتزار
واتم حاجیگیان ها جەتۆی مەزار
چەو بۆنە لێمان نیەن خەوەردار
ئەر زندە بیا چی دونیای غەدار
هاما وە لامان وە چار ناچار
لازم یەك شیوەن پەرێش کەموەیاد
داخ دەرونم بدەری وە باد
حاجی ( محەمەد ) دەروێش خاسم ڕۆ
بێزار جە دیدار سەید عەباسم ڕۆ
( خالص مخلص ) گەوهەرناسم ڕۆ
گیرۆدە وە دەست قەوم ناڕاسم ڕۆ
دەرون پڕ جە عەشق بێ وەسواسم ڕۆ
یار ڕای کاوە دوڕ شوناسم ڕۆ
بێ ڕازو ڕۆیەت بێ ئیغماسم ڕۆ
( ذو الفقار ) وە دەست تیغ ئەڵماسم ڕۆ
باوەی مام ئەحمەد مام نعمەتم ڕۆ
دوڕ گرانبار وەقیمەتم ڕۆ
گیروەردەی میللەت قەوم لوتم ڕۆ
ئیدارەی ویتەور زەقنەبوتم ڕۆ
برای موحتەرەم مام ظاهرم ڕۆ
مزەچەش نور پاك طاهرم ڕۆ

# نهێنیەکانی ناوجانتایەکی ڕەش

جمال غەمبار

— ١ —

**« لەجارانیش گەورە تری ! »**

بریا تۆزێ هەوا ئەبووی ،
ئەهاتیە دوو توێی سنگمەوە ..
تا لەڕازی ئاگراوی سییەکانم ،
ئەگەیشتی ..

•

وەك « ئۆکسجین » ،
ئەچوویتە نێو دەماخمەوە
هەتا تەواو بتزانیایە ،
کاسەی سەرم بەچ سۆزێ گەرم بووە ..
چیبکەم ، لەزمانی گریان ناگەی
دەنا ئاگری ئەم سۆزە ،
وەکو من تۆشی ئەسووتان ...

* * *

مەرگی خۆمم جێهێشتووە ،
بەسەر دڕکا هەنگاو ئەنێم ..
ئەمشەو شیعرێکیان سەربڕیم ..
لەبەر ئەوەی دێڕەکانی ،
لەناو چەمی زەردەخەنەیەکی تەنکی لێوەکانتا ،
خۆیان ئەشت !

* * *

مرۆڤ هەیە لەناخەوە پێئەکەنێ ..
هەشە لەناخی ناخەوە ،
ڕێژنەی فرمێسك ئەکاتە دیاریی خەمێکی !
من هێشتاکە تۆم نەدیوە ، لە ناخەوە پێبکەنی !
من نەمدیوی ، لەناخەوە فرمێسکەکانت بڕێژی !
بەڵام گیانە لە ناخەوە ،
ئەشکت بەمن هەڵڕشتووە !
ها ، کە بیستت ، سنەوبەرێ لە گلێنەما ڕواوە !!

* * *

— ٢ —

**بەیەکاچوون**

بە هێمنیی ، بیر لەدنیای چ گەنجێکی
سەر لێشێواو ئەکەیتەوە .. ؟!
خەمەکانت لە خەمەکانی خوا ئەچن ،
نە ڕەنگیان لەخۆ گرتووە ، نە سیمایەك .. !
منیش وێڵم ، نەشارەزای ئەم ڕێگەیەم
دڵم بۆتە چاوساغێکو

ئەچرپێنێ ،

● بەم ڕێگایەدا گوزەر کە ..

★ ئەمە ڕێگای دارستانە ،
دارستانیش من ناناسێ ..
دارستانیش ،
نە لە خەمی ۆ ئەگات و
نە گریانی من ئەبیستێ !

* * *

— ٣ —

**« ســـاتی شـــیعریی ! »**

ڕووبارێکی زۆر بێنازی ئەم وڵاتەین ،

وەك ملوانكە ،
بە بەرۆكیا هاتووینە خوار ..
من بۆ عەشقی خۆشم ئەوێی ،
ئەبەدی بێت !

چیبکەم ! لە زمانی گریان ناگەی ..
دەنا بەگری ئەم سۆزە ،
تۆش ئەسووتای !!

* * *

ڕەنگە ئێستا ،
لەم « ساتە شیعری »یەی منا
ڕویت بۆ ڕادیۆ بچکۆلەکەت هەڵخستبێ ..
پەنجەکانت .. یاری بە دوگمەکەی بکەن ..

هەواڵی جیهان ئەبیستی ..
یان ، گوێ لە هۆنراوەیەك ئەگریت ..
ئاخۆ بیرت ، وێڵی کام دووڕگەی
پڕ خەم بێت !؟
تۆبڵێی ئێستا ،
لەم ساتە شیعرییەی منا ..
لە بیرتا بم !؟

* * *

— ٤ —

تۆ ، گریانی !؟
یا گریان لە ناخی شیعرا دروست ئەکەی !؟
بەیانیانێك ،
هەتاو تێکەڵ بە دەنگی چۆلەکەکان ئەبێ و
بەئاگا دێم !
حەزم وایە ،
بەیانییەك خۆر لەدەم کەل دەرنەکەوێ و
هەتاوی چاوەکانی تۆ ..
لە دەریای خەوم ڕزگارکا !
ئەم حەزەی من ، کەی دێتە دی !؟

* * *

— ٥ —

شتێ کەمتر لەم وڵاتە خۆشم ئەوێ ..
ئەم وڵاتە هەناسەمە ،
ئەم وڵاتە بۆتە دڵم ،
تۆش خوێنمی و بەهەردووکتان ،
منێکتان دروست کردووە .
« هەندێ جار لەتەنیاییدا ،
غەمەکانم وەك چرا دائەگیرسێنم ..
هەندێجاریش چەپکێ هەتاوی سەربراو
هەڵئەگرم و
وەك شێت بەکۆڵانەکا ئەگەڕێم ! »(٢)

* * *

— ٦ —

عاشقێك مرد ..
پێش‌مردنی ، گشت وەسیەتەکەی ئەمەبوو ..
« — پاش مردنم ..
کاسەی سەرم بکەنەوە ،
چی خۆشەویستیی تیاهەیە ..
دەری بێنن ..
بیدەنە دەست ، ئەو ئافرەتەی ،
پێش مردنم ..
پالەوانی هەمیشەیی خەونەکانی شەوانم
بوو ..
ئەو ئافرەتەی زۆر لەمێژبوو ..
دلمی لابوو ..
با وەکو لاشە ساردەکەم ، نەیبەمە ناخی
گڵەوە ..
چونکە ئەوین لاشە نییە ،
ببێتە خۆڵ .. !! »(٣)

* * *

— ٧ —

تۆ بۆم بوویتە خەم ..
بوویتە حەزێکی ڕەواوی‌گیانم ،
ڤینێکی پاکت لەناخما ڕواند ..
نازانم چۆنە ، وا خۆشم‌ویستی ،
وا هۆگرت بووم ؟

(١) ووتەیەکی فەروخی فەروخزادە ، هاوڕێیەکی شاعیرم لەنامەیەکیدا بۆی نووسیوم .

(٢) کۆپلە شیعرێکی شاعیرێکەو خراوەتە شیعرەکەوە .

(٣) کاریگەریی ووتەیەکی « ئەنشتاین »ی زانای نەزەرییەی نیسبی پێوەیە .

# منالانی بۆرما

خەڵکێکی زۆر لەو گۆڕەپانەی کە کەوتبوە بەرانبەر وێستگەی هێڵی ئاسنی لە جەنەوا کۆبۆوە ، زۆربەی ئەم خەڵکە لە کرێکارەکان بووە ، بەڵام لەناویانا چەند کەسێکی خۆش گوزەران کەجلی جوانیان لەبەرابوو بلاو ببوونەوە، لەپێش ئەم خەڵکەوە ئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانی شارەکە ڕاوەستابوون‌و بەیاخە ئاوریشمەکەی شارەکە لەسەر سەریانە وە ئەشەکایەوە ، هەروەها بەتەنیشتیەوە بەیاخەکانی ڕێکخراوە کرێکاریەکان کە هەمە ڕەنگ‌بوون بەرزببوونەوە ، ڕیشوەکانی کە پیا شۆڕببوەوە ڕەنگی ئالتونی ئەنواند .

هەروەها قەراغەکانی‌و پەتەکانی دەوروبەری ئەو کۆلەکانەی کەپێوەی بەندکرابوو ، دەنگی لەرینەوەی ئاورێشمەکان‌و دەنگی هێواشی لە ئاسمانْدا بەرز ببوونەوە .

پەیکەری کۆلمبوس کە زۆر ئازاری چەشتبوو لە ڕێگەی بیروڕاکانیا لەسەر بنکەیەکی لاکێشی دانرابوو ، هەر بەهۆی بیرو باوەڕەکەیەوە بوو سەرکەوت ، لەم پەیکەرەیدا تاکو ئێستاش هەر سەیری خوارەوە ئەکات ، بۆ خەڵکی هەر وەکو بەهەردوو لێوەکەی بڵێ :

« تەنها ئەوانەی باوەڕیان هەیە لە توانایاندایە سەرکەون » مۆسیقاژەنەکان ئامێرەکانیان بەدەوری بنکەی پەیکەرەکەدا دانابوو، مسی ئەم ئامێرانە وەك ئالتون لەبەرتیشکی خۆرەکەدا ئەبریسکایەوە .

خانوی وێستگە بازنەییەکە هەردوو لاکانی درێژ کردبوو ، هەروەکو بیەوێ باوەش بکات بەملی ئەو خەڵکەی چاوەڕێیان ئەکرد .

لەبەندەرەکەدا دوکەڵی پاپۆڕەکان بەرزبۆوە.

هەروەها دەنگەدەنگی مەکینەکانی لە ژێر ئاوەکەدا ون ئەبوو وە زرەی زنجیرەکانی زیکەی لێ ئەهات‌و ئەی قیراند ، بەڵام گۆڕەپانەکە هەر بەهێمنی مابۆوەو لە ژێر تیشکە گەرمەکەی خۆرەکەدا ئەدرەوشایەوە .

لە بالکۆن‌و پەنجەرەی ژوورەکانەوە ژنان ڕاوەستابوون‌و گوڵەکانیان بەدەستە وەگرتبویان لە تەنیشتیانەوە دایان نابوو .

منالەکان وەکو گوڵ بەجلی پشوودانەوە ڕاوەستابوون .

کە شەمەندەفەرەکە گەیشت‌و فیکەی لێ‌ئەدا خەڵکە کە هەموو کەوتنە جوڵە ، هەموو شەپقەکانیان هەوادا ، وشێوەی خۆیان ون‌کردبوو ئەت ووت باڵندەن‌و بەئاسماندا ئەفرن .

مۆسیقا ژەنەکان تەپڵەکانیان هەڵگرت ، لەپاشا پیاوە پیرەکان جلەکانی بەریان بەخێرایی ڕێك‌خست ، و ڕوویان کردە کۆمەڵەکەو بەتووڕەیی‌یەوە قسەیان ئەکردو دەستیان بەڕاست‌و چەپدا بائەدا .

بە هێواشی خەڵکەکە ئەو کۆڵانەیان بڕی کە ئەچۆوە سەر جادەکە بۆ ئەوەی بزانن « ئەوانە کێن کە هاتوون بۆ پێشوازیان » .

**« ئەو منالانەی کە لەبۆرماوە هاتوون »**

مانگرتنەکە لە بۆرما هێشتا بەردەوام بوو ، خاوەن کارەکان نایانەوی خۆیان بدەن بەدەستەوە، کرێکارەکان لەبێ پارەییەکی زۆر خنکێنەردا بوون ، ناچاربوون بڕیار بدەن منالەکانیان دوور بخەنەوە لە بۆرما بۆ ئەوەی لە مردن‌و برسێتی ڕزگاریان بکەن .

لە پشت کۆلەکەی خانوی وێستگەکەوە کۆمەڵێ خەڵك بەڕێکوپێکی ئەڕۆیشتن لەشی ئەمانە ئیوە ڕووت بوو ، هەر لە ئاژەڵی سەیریان

## ▪ چیرۆکی: ماکسیم گۆرکی

## ▪ وەرگێڕانی عمر عبدالرحمن



ئەکرد ، پیس‌و جل‌دڕاو بوون ، لەڕۆیشتنەکەیاندا دەستیان لەناو دەستی یەکتری نابوو ، لەشیان بچوك بوو ، هیلاك بوون ، دەم‌و چاوەتیژەکانیان خۆڵ دای پۆشی بوو ، لەگەڵ ئەوەشدا چاویان ئەبریقایەوە ، کاتێ مۆسیقا ژەنەکان دەستیان کرد بەلێدانی « پارچە مۆسیقای غاریبالدی » زەردەخەنەو پێکەنین لەو دەم‌و چاوە ناسراوانەدا دەرکەوت کە برسێتی هیلاکی کردبوون .

خەڵکەکە بەدەنگی بەرز بەخێرهاتنی پیاوان‌و ژنانی دواڕۆژیان کرد ، لە هەمان کاتدا بەیاخەکان لەبەردەمیاندا ئەشەکانەوە ، زوڕناکان لێ‌دران‌و منالانیان دلخۆش ئەکرد ، ئەم بە پیرهاتنەوەیان بەلاوە سەیر بوو .

تۆزێ ڕاوەستان‌و ، ئینجا خێراخۆیان ڕێك خست ، تاکو گەورەتر بنوێنن .

دەنگ لەسەدان قوڕگەوە ئەهاتە دەرەوەو هاواریان ئەکرد :

**« بژی ئیتالیا »**

خەڵکەکە بەرەو ڕوویان هاتن‌و هاواریان ئەکرد « بژی بۆرما » .

مناڵەکان هاواریان ئەکرد «بژی غاریبالدی»

له پاشا خۆیان کرد بەناو خەڵکەکەداو وەکو لەناویانا قووت درابن وابوو ، لەپەنجەرەو سەربانی ماڵەکانەوە دەستەسڕەکان وەکو باڵندەی سپی ئەلەرینەوە ، وگوڵ ئەباری بەسەریانداو هاوار بەسەر خەڵکەکەوە دەنگی ئەدایەوە . هەموو شتێ ڕەنگی جەژنی لێ‌نیشت ، ژیان کەوتە هەموو شتێکەوە ، بەیاخەکان لەشنە بادا شەپۆلیان ئەدا ، گوڵ‌و شەپقەکان بە هەوادا ئەفڕین ، سەری مناڵەکان لەناو خەڵکەکەوە بەرز بوونەوە ، بەدەستە بچوکە نازدارەکانیان ئەیانویست گوڵەکان بگرنەوە ، هاوارێکی دوایی نەهاتوو لەهەوادا دەنگی دایەوە « بژی سۆشیالیستی » .. ! « بژی ئیتالیا » .. !

بردنەوەی مناڵەکان بەرەو تەواو بوون ئەهات ، هەندێکیان چووبوونە سەرشانی پیاوەکان ، لەکاتێکدا ئەوانی تر لەباوەشی سمێڵ گەورە سنگ پانەکاندا بوون . دەنگی مۆسیقاکان لەناو هاوارو پێ‌کەنینی خەڵکەکەدا بڵاو ئەبۆوەو وورده وورده وای لێ‌هات به حاڵ ئەبیسترا .

ژنەکان خۆیان کرد بەناو خەڵکەکەدا بۆئەوەی ئەوانەی مابوونەوە لە هاتوەکان بیانبەنەوەو هاواریان ئەکرد « ئەنیتاتۆ دوان ئەبەیتەوە ؟ » .

« بەڵێ ... ئەی تۆ ؟ » « دانەیەکت بیر نەچێ بۆ مەرگریتە شەل » .

هەستی دلخۆشی هەموویانی داگرتبو ، لەهەموو شوێنێکا ڕووەکان کراوە بوون ، چاوی بەزەیی فرمێسکاوی ، هەندێ لەمناڵی مانگرەکان نانیان ئەقرتاند .

پیاوێکی پیر کەلووتی لەدەنووك ئەچوو ، جگەرەیەکی ڕەشی بەدەمەوە بوو ووتی :

« لە زەمانی ئێمەدا کەس ئەمەی بەخەیاڵدا نەئەهات » ..!

« چەند ئاسانە .. » « بەڵێ ئاسانو بەجێیشە .. »

پیرە جگەرەکەی لەدەمی دەرهێنا ، و سەیرێکی ئەملاو ئەولای خۆی کردو هەناسەیەکی هەڵکیشاو سوتووی جگەرەکەی بڵاوکردەوە ، لەپاشا دوومناڵی بچووکی لە مناڵەکانی بۆرما بەرێ‌کرد ، ئاشکرا دیار بوو ئەم دوانە بران ، ڕووی پیاوەکە شێوەیەکی گرژی وەرگرت ، بەڵام مناڵەکان بەتەواوی سەیری ئەمیان ئەکرد ، ئەم سەیرکردنە وای لەپیاوەکە کرد ، پاڵی نا بەشەپقەکەیەوە تا گەیشتە سەر چاوی‌و دەستەکانی هەڵگلۆفت ، دوومناڵە بۆ دواوە گەڕانەوە . لەم کاتەدا پیاوەکە چەمایەوە بۆپێشەوەو وەك کەلەشێری ڕۆمی هاواری کرد ، هەردوو مناڵەکە دەستیان کرد بەپێکەنین‌و قاچیان

ئەدا بە زەویدا ، پیاوەکە هەستاو شەپقەکەی ڕاست کردەوەو بێ‌ئەوەی خۆی تێك بدات دەستی بەڕۆیشتن کرد ، وای هەست ئەکرد ئەو ئەرکەکەی سەرشانی خۆی بەجێ هێناوە .

لای بنکەی پەیکەرەکەی کۆلمبوس ئافرەتێك ڕاوەستابوو ، قژێکی خۆلەمێشی‌و ڕوویەکی پر چرچی پێوەبوو ، چەناگەی ئارەقی کردبۆوە ، گەنەموویەکی خۆلەمێشی لێوەهاتبوە خوارێ ، دەستی کرد بەگریان‌و فرمێسکی هەردوو چاوە سوربوەکەی بە قەراغی کۆلوانە زەردەکەی ئەسڕی ، لەگەڵ ئەوەشدا کە گەنمە ڕەنگێکی

تێربوو ، بەڵام زۆر گورج‌و گۆڵ بوو و لەناو خەلکەکەدا ڕاوەستا بوو ، هەروەها ئافرەتێکی مناڵ‌کار قژێکی ڕەشی پێوە بوو هات ، لە خەڵکی ( جەنەوا )ی ئەکرد ، مناڵێکی حەوت ساڵەی بەدەستەوە بوو .

ئەم مناڵە قاپقاپێکی لەپێ‌دابوو شەپقەیەکی خۆلەمێش گەورەی لەسەرکردبوو قەراغەکانی ئەگەیشتە سەرشانی ، سەرەبچکۆلەکەی ڕاوەشان تاکو شەپقەکە لەسەرچاوی لابدات بەڵام شەپقەکە هەر ئەخزا بۆپێشەوە تاکو ئافرەتەکە بۆی داگرت ئینجا لەباکەدا یاری پێ ئەکردو پێ‌ئەکەنی‌و گۆرانی ئەوت ، مناڵەکە سەری ڕاوەشان بۆ دواوە تاکو توانای بینینی هەبێ‌و دەم‌و چاوی پێکەنینی لێ ئەباری ، دوایی بازێکی‌دا بۆ ئەوەی شەپقەکەی بگرێتەوە ، لەپاشا هەردوکیان لەبەر چاو ون بوون .

پیاوێکی درێژ ، دوو قۆلی ڕووتی بەهێزی هەبوو ، چاکەتێکی چەرمی لەبەرابوو ، کچێکی شەش ساڵەی بەدەستەوەبوو کە بەگشتی شێوەی لەمشکێکی خۆلەمێشی ئەکرد ، بەو ژنەی ووت کە لەتەنیشتیەوە ئەڕۆیشت‌و کوڕێکی قژ سووری تۆخی بەدەستەوە بوو :

« تێ‌گەیشتی مەبەستم چی‌یە ؟ »

« ئەگەر کارەکە بەم جۆرە بڕوا زاڵ بوون بەسەرماندا ئاسان نی‌یە ... وانی‌یە ؟ »

ئینجا بە پێکەنینێکی سەرکەوتوانەوە مناڵە بچوکەکەی هەڵدا بۆ ئاسمان‌و هاواری کرد :

**« بژی بۆرما »**

وورده وورده خەلکەکە بڵاو بوونەوەو مناڵەکانیان هەلگرتبو یان دەستیان گرتبون .

گۆڕەپانەکە کەسی تیا نەما تەنها ئەو گوڵانە نەبێ کە لە ژێر پێدا شێلرابوون ، لەگەڵ گاغەزی نوقڵەکان ..

پەیکەری ئەو پیاوەی کەجیهانی تازەی دۆزیەوە بەسەریا ئەیڕوانی . دەنگی خەڵك بەجادەکاندا دەنگی ئەدایەوەو هەموو بەرەو پێشەوە ئەڕۆیشتن بەرەو ژیانێکی تازە ، هەروەکو دەنگی سەفەربەلکی گەورە وابوو .

**تێبینی :**

ئەم چیرۆکەم لە گۆڤاری ( الهلال ) ژمارە ٢٣٣ ئاباری ساڵی ١٩٦٨ لە عەرەبیەوە کردووە بەکوردی ..



## نەورۆز

ئەم رۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بەهاتەوە
چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێ پەست بوو تاکو پار
هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار
ئەو رەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد
مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوور و نزیک ئەبرد
نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە
لاوان بە عەشق ئەچوون بە بەرەو پیری مەرگەوە
ئەوا رۆژهەڵات . لە بەندەنی بەرزی وڵاتەوە
خوێنی شەهیدە رەنگی شەفەق ئەیداتەوە

تا ئێستە رووی نەداوە لە تاریخی میللەتا
قەڵغانی گوللە سینگی کچان بێ لە هەڵمەتا
پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین
نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا ئەژین

